

# شەوگاری گورگان

نووسینی:
محەمەد کەریم ئاندوا



حکومەتی هەرێمی کوردستان
وەزارەتی رۆشنبیری
بەڕێوەبەرایەتی گشتی چاپ و بڵاوکردنەوە
بەڕێوەبەرایەتی چاپ و بڵاوکردنەوەی هەولێر

سەرپەرشتیاری گشتی
ماجید نووری

# شەوگاری گورگان

نووسینی: محەمەد کەریم نانەوا
بابەت: ڕۆمان
پیتچنی: کاکە بێجان
هەڵەچنی: دڵشاد قادر
نەخشەسازی ناوەڕۆک: ئاسیا صباح
نەخشەسازی بەرگ: ئامانج ئەمین
تیراژ: ٥٠٠دانە
چاپ: بەڕێوەبەرایەتی چاپخانەی ڕۆشنبیری- هەولێر
نرخ: ٢٠٠٠ دینار

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان
ژمارە سپاردنی (١٤٤) ساڵی (٢٠١٤)ی پێدراوە



بەڕێوبەرایەتی چاپ و بڵاوکردنەوەی هەولێر
هەولێر- گەڕەکی راستی/ نزیک گەراجی بەغدا
باڵەخانەی بەڕێوەبەرایەتی چاپخانەی رۆشنبیری
ژمارەی تەلەفۆن: ٠٦٦٢٥٨٥٤١٣

- • -

گوندەکەمان لەشـــوێنەکی زۆر خۆش و لەدەشتاییەکی پان و بەرین دابوو، بەهاران هەتا چاو هەتەرە دەکات یەکپارچە ســـەوزایی وگوڵ و لاولاوەو کوریکەنیســـان و کنێرو گوڵە خەزێمە و گوڵە حاجیلەو گوڵە هێرۆ سەریان تێک دەنا، لالەزارێک بوو،مەپرسەچەند جوان و دڵگیربوو، مێگەلی مەڕومـــاڵات و گاڕەش و چوارپێ پێوەردەبـــوون دەلەوەڕان، چرتەیان دەهات ئەم گیایە سەوزو تەڕوتازەیان دەخوارد.

لەهەمووی جوانتـــر ئەوەبوو! ئەوکاتەی کەشـــۆخەژنان وکیژۆکاڵی ئاوایی بەپۆشـاکی ئاڵاو واڵا بەرامپیلیان بەرامپیل دەدا، ســـێ ســـێ، چوار چوار، بەکۆمەڵ (پیشەقان) یان بەدەستەوە دەگرت، هاوشێوەی ڕەوەی مامزان لەئاوایی دەچونە دەرەوە، لەم ئاقارو بەیارانەدا بەناوگوڵ

و گوڵــزاردا پەرتەیــان لێدەکرد، بەدوای کەنگرو کاردی، شیلمشـــاق و زەرگــەزەوی، پیفۆک و کوارگ، دۆمبــەران و گورۆکەدا دەگەڕان و دەسووڕان

چاویان دەگێڕا، ناوە ناوە بارەکچێک پەنجەی شـــادەو دۆرە درێژەی جووت

دەکردو دەینایە قۆرتی گەردەنی،تێی هەڵدەکردە .! «بەلۆرەبەلۆرە» وەکــو هۆزار دەیچریکاند، لەنواڵەو پێدەشـــت و زوورگەکانەوە دەنگی دەداوەئەوە .! نهێنیەکی نێوان خۆشەویســتان بوو،کاکەی شوان گوێ قـــوڵاغ بوو، بەبلوێرەکەی وەڵامی دەداوە، بەئاوازی وادەی جێ ژووانی شەوو ڕامووسانیان بۆیەکدی دەست نیشان دەکرد.

لەوەش جوانترو خۆشـــتر ئەوەبوو.! کەکیژۆکاڵ تێلەگەیان پڕدەکرد لەکەنگرو کاردی وپاشان یەکدی گرددەبوونەوە هەتا شل کوت دەبوون شـــایی و هەڵپەڕکێیان دەکرد، دواتر چەشـــنی ڕەوەی قازو قورینگ بەرەوماڵ دەبوونەوە.

گوندەکەمـــان کەوتبـــووە نزیـــک کەندێک، بە (کەنـــدی کۆرکەران) ناســـرابوو، لەوەرزی زستان و بەهاراندا لێوان لێودەبوو بەئاوی باران، ئاومارکی لەگەڵ خۆی دەهێنا، هەرزەکارانی ئاوایی هەتا ســـەر ئەژنۆ دەلینگی شەرواڵیان هەڵدەکرد، لوولیان دەدا هەتا تەڕ نەبێت، دەچوونە ناولێشاوی کەند ئەو ئاومارکانەی کەهێشتا بەئاوێدا دەچوون ئاو فڕەی نەدابوونە قەراخ، دەیانگرتنەوە و دەیانبردنەوە بۆ ماڵ، بۆ سووتەمەنی سوودبەخش بوو.

لەڕۆژانـــی خۆش و ســـاماڵ، کیژگـــەل و ژنانی ئاوایـــی مەنجەڵ و کەلوپەلی ئەوەی پێداویســـتیان بوو دەیانکردە کۆڵەپشـــت، دەچوون بۆکەنـــدی کۆرکـــەران لـــەدووری ئاوەدانی دەراوێکی خـــۆش و لاڕێی لێبـــوو، دوای ئەوەی بارگەیان دادەنا، هەندێکیان دەچوون دارودوویان خڕدەکـــردەوە، هەندێکیـــان ســـێکوچکەی ئاگردانیـــان دادەمەزراند،

مەنجەڵیان دەخستەسەر سێکوچکەو پڕیان ئاودەکرد، پاشان ئاگردانیان ئاگردەدا، ئیدی بەشـــوونک خەریکی جل شـــۆرین دەبوون، دواتر بە ســـابوون و (گڵەسەر)سەری خۆیان دەشووشت، پاشان بەلیفکە پشتی یەکدیان دەشووشت.

چـــڕە دووکەڵـــی کۆرکـــەران لەگـــەرووی ئەوکەندەدا بەئاســـماندا هەڵدەچوو، دیمەنێکی هێندە جوان و قەشـــەنگ بوو مەپرســـە،! چاو لێی تێرنەدەبوو.

هێـــواران بەرەبەری زەردەپـــەڕی خۆرئاوابوون، لەشـــوێنەکی بڵند دەســـتت بکردبایـــە چەپـــەری چـــاوت، بەهـــەر چـــوار لای ئاواییدا بتڕوانیبایە.! تۆزو گەردەلوولی مێگەلی مەڕو ماڵات تێکەڵ بەتیشـــکی زەردەپـــەڕی خۆرئاوابوون دەبوو، ئاای کەدیمەنێکی جوان و ســـەرنج ڕاکێش و دڵفڕێن بوو، لەهەمووی جوانترو قەشـــەنگتر کاتی لەبێردان بوو، ئەو دەمەی کەشـــەنگەبێری بەنازو عیشوە مەنجەڵی مەڕدۆشینی هەڵدەگـــرت، بەلەنجەولار بۆ لای بەردەبێـــری دەڕۆیی، ئاگری لەدڵ و دەروونی کاکەی شـــوان بەردەدا، پاشـــان کاروبەرخ تێبەردەردران و لەوکاتـــەی کەلەگەڵ دایکیان لێک هەلاوێردەکران، ســـەدای باعەباع و ماعـــەی بزنان، ســـەمفۆنیایەک بوو گەلێک لەســـەمفۆنیای (بتهۆڤن) خۆشترو بەسۆزو کاریگەرتربوو.

نازانم بەچ زمانێک؟ باســـی سەرپالەو ســـەپان و تێلەکێشان بکەم، کاتێ کەبەگۆرانی (هەدرونەدرونە)دەچوونەبەر(گازێ)بەریان لەتەبارە دەگـــرت، چرتەی داس و قەیناغیان ڕۆژە ڕێیەک دەڕۆیی، تەبارە خۆی لەبەر نەدەگرتن، باســـی چی بکەم؟ ڕۆژانی شەغرەکێشـــان، گێرەی قرشـــەکوتین، ســـواری جەنجەڕو شـــەنەباو کووزر کوتانەوە، شەقڵ کردنی ڕەوسەی گەنم و جۆ، ســـوێم دەبێتەوە بۆ شەوانی (کاکێشان) ئەوە هەرخۆی لەخۆیدا شـــایی و شـــەهیانەبوو بۆ گەنج و بارەکیژان، چەندە خۆش بوو ئەو ڕۆژانەی کەداپیرە ئامینەو پلکە بەسێ و پوورە

سـوڵتانە، ئەوکاتەی کەسـاوارییان دەکوڵاند، ئێمـە منداڵانی ئاوایی هەریەکەو (لەگەن)ێکمان بەدەسـتمانەوە دەگرت، هەیپامان لێدەکرد بۆ لای داپیرە، (دانوو)ی بۆمان تێدەکرد، لەخۆشـیان پێمان عاردی نەدەگرت، گریانم دێ بۆ بەزم و ڕەزمی شەوانی ساوارکوتانەوە، چاوە چاوبووین زوو دەسـت هەڵگرن، بەڵکو ئێمەش بەشـە شـەوچەرەی خۆمان وەربگرین.

جەرگم ژان دەکات بۆ ڕۆژانی سەرماو سۆڵەی زستان، کەبەپێخواسی دەچووین بۆسەر گووفەک و شوێنی زبل و زاڵی ولسات (فاق)مان دادەناوە، دواتر دەچووین لەژێر سواندەی خانوو پشتمان دەدایە دیوار لەسەرمان هەردەلەرزین، دەستمان دەچوو، پەنجەکانی دەستمان نەدەگەیشتنەوە یەکدی، لەسەرمان تەزی بوون، دەمانگوت: کێ بەدەستی پێی دەکرێ پلاو بخوات.؟! ئەوەی بیتوانیبا سەرپەنجەکانی دەستی وێک بینیتەوە بیانگەینێتە یەکدی.! واتا پلاوی پێدەخورێ، بەلام پلاوی چی.؟! کوا پلاو برنج بەدەست دەکەوت، مەسەلە خەیاڵ و تامەزرۆیی بوو، ئەگینا جەژنەو چەژنە بەدیداری پلاو برنج شـاد دەبووین، بەم سەرماو سۆڵە لەپەنا دیوار چاوەچاوبووین، کەکێشکەیان سواندووکە، جورە، ڕەشۆڵە، چۆلەکە یان سۆفەقیتە و بوغاز بەفاقی وەدەبێ، بەتاسووقەوە هەستمان ڕادەگرت، کەچرتەی تەقینی فاقەکەمان دەبیسـت، پێکڕا دەمانگوت: ئەها لێیدا پێوەبوو، هەیپامان لێدەکرد زوو دەگەیشتینە سەری نەبادا بەفاقێوە مردار بێتەوە، ئەوجا هێواران دوایی نوێژی شێوان، چۆلەکەو ڕیشۆڵەکانمان سەردەبڕین، لەسەر ئاگری بەردەسێرەو نێڵەنێڵی ئاگری سـۆبەی بەقشـپل پەیتا پەیتا دەمانبرژاندن، هێندە بەتام و لەزەت و خۆش و چێژداربوو، بەهێسـکەوە دەمانکرۆژتن، پاشان بەهەقایەت و مەیل مەیلانێ شـەوگارمان بـەڕێ دەکرد،ماڵی وێرانم بۆ ئەو ڕۆژانەی کەبەسەرچوو ڕابرد، هەرگیز ناگەڕێتەوە.

بێجگە لەماڵی ئاغا، نزیکەی حەفتا خانەوادە لەم گوندە خنجیلانەیە

ئاكنجی بوون، خانووبەرەی ئاغای دێ لەهەورازی ئاوایی لەسەربستیەک بەسوغرەکاری بەشان و پیلی خەڵکی گوندی لەسەر شێوازو ئەندازەی شارستانی لەدوونهۆم وکۆشکەک دروست کرابوو، بەسەرتەواوی ئاواییدا زاڵ بوو، کەمێک بەولاتر حەوشەو حەساری ئاغابوو پتر لەپێنج هەزار مەتردووجـــای داگیرکردبوو، هۆری مێگـــەل و تەویلەی وڵاخی بەرزەو یازدە (هۆدە)شـــی تێدابـــوو، ماڵە ســـەپان و ڕەنجبـــەری ئاغا تیایدا نیشتەجێ بوون، بەڵام ئەوانەی ئاوخۆرەوە و کرێیارەو جوتیاری وەرزی بوون، لەدەرەوەی حەسارێ خانوویان لەخشت و قوڕ دروست کردبوو، دیوەخانی ئاغـــای گوند کەوتبووە بەرامبەر (بیـــری ئاو)، کەئافرەت دەچوون بۆ ( ســـراوێ)دەبووایە بەپێـــش دەروازەی دیوەخاندا ڕەتبن، شوێنی دانیشـــتنی ئاغا لەدیوەخان ڕێک دەیڕوانییە قاناتی بیری ئاوو ڕێی هاتوچۆ بۆ سەر جۆخینان.

ئەگەرچی خاکی گوندەکەمان خاکێکی کشتوکاڵی بەپیت و بەرەکەت بـــوو، بەڵام کـــردەی خەڵک و بـــردەی ئاغابوو، چونکی ســـەرەڕای ســـوغرەکاری، لەبیســـت عەلبەگەنم ئاغا چوار عەلبـــەی لەو جوتیارە وەردەگرت، لەپای ئەوەی لەزەوی ئاغا (تۆ)ی کردووە.

وەبیرمە ڕۆژێکیان لەجێ جۆخینان لەگەڵ منداڵانی ئاوایی گەمانمان دەکرد، وەختێـــک دیتمان! لەپێش هەیوانی دیوەخان بووە قەڕەباڵغی و دەنگـــە دەنگ، پێمان پێوەنا چووین دیتمـــان دووخزمەتکاری ئاغا بەقایشی تفەنگ هەردوو پێی (عەدۆ)یان فەلاقەکردبوو وەریانگێڕابووە سەرپشـــت، هەردوو لاقـــی لەحەوابـــوو، ئاغا حەیزەرانەکی شـــلکی بەدەســـتیەوە گرتبوو، بەهەموو هێزو قوەتی خۆی لەبنی پێی عەدۆی دەدا، زیڕەی دەگەییە ئاسمانی حەوتەمین، کەچی کەسێک دەسەڵاتی نەبوو دەستی ئاغابگرێ.

عەدۆ تاقانـــەی داکو بابی بوو، گەنجێکـــی حولحولی بوو، پێگیری لەفەرمانی ئاغاکردبوو، گوتبووی (من ســـوغرە لۆبابم ناکەم، نەخاسمە

بۆ ئاغا)عەدۆ بنی هەردوو پێی هەڵپەنمابوو لەگەڵ لێدان، لێی کردبووە پفکە و ئاوزلە، کەدەڕۆیی گۆدببوو، کەشەقاوی دەهاوێشت وەک ئەوەی تازە (سوننەت)کرابێ گەلاوگەڵ دەڕۆیی.

ئەوانــەی هەموو بەلایەک بــەڵام کــردەوەی (دزی)کاری بەلایەک، ئەگەرچـــی هەندێــک لەبنەماڵەی ئاغاکان لەنێــوان خۆیاندا ناکۆک و ناتەبابوون، بەڵام لەئاست خەڵکی ڕەش و ڕووت و بێچارە یەک دەنگ بوون، جا لە شـــەوانی تاریک و ئەنگوستەوچاودا، بەمەبەستی دزی و هەتک پێکردن بەخورتی و زۆردارەکی زەلامیان دەنارده سەریەکدی.

لەرپــش چەرمووانـــی ئاوایـــی گـــوێ بیســـت بـــووم دەیانگێڕاوە دەیانگۆت (ســـاڵێک لەساڵان شەوێکیان تاریک بووچاوچاوی نەدەدیت، ئاغا بەزۆری و زۆردارەکی ســـێ زەلام دەنێرتە سەر ئاغایەکی ناحەزی خۆی، بەڵکو زەبرێکی کوشندەی لێبدەن،کاتێ کەزەلامەکان دەگەنەنزیک گوندی سەگەل سەڕەویان بۆ دەبەن، نۆبەدار پێدەحەسێن لێیان دێنە دەســـت، دەبێتە شـــەڕە تفەنگ، یەکێک لەو سێ زەلامانە ناوی (سلۆ) بوو، گوللەیەک قۆرنجی چەپەی پێکابوو، بەهەرحاڵی هەبووە لەئاوایی بەدووری دەخەنەوە، بەڵام برینەکەی سەخت و کاریگەردەبێ، لەپەلوپۆ دەکەوێ، هاوڕێیەکانی بەناچاری لەناو بنەتووترکان بەجێی دێڵن، خۆیان دەربازدەکەن، کابرای بریندار لەناو بنە تووتڕەکان گیان دەســـپێرێ، شەوی پاشتر بەدوای سۆراخیدا دەچن، دەبینن کۆچی دوایی کردووە، ئیدی لەترســـی ئەوەی ئاشـــکرانەبن، هەربەم شـــەوە لەهەمان شوێن قۆرتەکی بۆهەڵدەقەنن، هەربەپۆشـــاکی بەری دەیخەنە ناو قۆرتەک و بەگڵ دایدەپۆشن و دەیشـــارنەوە، ناشوێرن لەترسی حکومەت شکات بکەن، ســـلۆ، لەترِی ســـەی دەچێت و ماڵ و منداڵی ڕووت و ڕەجاڵ دەبن، ئاغاش بزەی سمێڵی دەهات نەپەکونەبەلا.)

خەڵـــک لەژیانی خۆیاندا بێزارو وەڕس ببـــوون، بەدوای دەرەتانێک دەرگایەکدا دەگەڕان، بەڵکو لەم کولەمەرگییە ڕزگاریان بێ.

لەیادمـــە ئەو ڕۆژەی کەباوکـــم کۆچی دوایی کرد، مـــن ئەوەندەی پەڕۆشی (شـــیوەغەریبە)ی هێواران بووم، نیوە هەندە لەخەمی کۆچی دوایی باوکم دا نەبووم، چونکە لەو وەختە لەهەمووی خۆشتر بەلای من ئەوە بوو.! منداڵەکانی هاوتەمەنی خۆم بوون، ئیرەییان پێم دەبرد، لەبەر ئەوەی چونکی من کوڕی کابرای وەغر کردووبووم دەیانلاواندمەوە، شان بەشانی پیاوەگەورەکان لەسەر سفرەی خوان دادەنیشتم شیوەغەریبەم دەخوارد، ڕەورەوەی ڕۆژگار پشـــوونادات نازانم چەند جۆخین بەسەر کۆچی دوایی باوکمدا تێپەڕی بوو، (مامەم) بێوەمێرد بوو دایکمی مارە کردبۆوە، ماوەیەک بوو هەستم پێدەکرد سوار پایسکلێکی لایدە دەهاتە گوندی، کەئەو دەهات مامەم و دەروێش سمایل و سۆفی عەلی و دێوانە یاهوو مـــام حەمەد کەپوو چـــرادان و هیدیکەش،هەرجارەی لەماڵێک خڕدەبوونەوە، نەیاندەهێشت ئێمەی هەرزەکار تخونیان بکەوین، بەڵام من دەچووم لەپشتی دەرگاوە هەستم ڕادەگرت، گوێم لەفسکە فسکیان دەبوو کەچی هڕەم لەبڕەی دەرنەدەکرد.

وابوو ڕێک وەبیرمە لەســـاڵی هەزارو نۆسەت و پەنجاوسێ، فەلاحی دەشـــتی هەولێر لەئاغەواتی گونـــدەکان هەڵگەڕابوونەوە، لەدژی زوڵم و ســـتەم و چەوســـاندنەوە و دەرەبەگایەتی ڕاپەڕی بوون، هەموویان ســـوێندیان بە (تەلاق)خورادبوو، کەچیتر گوێڕایەڵی فەرمانی ئاغاکان نەبن و هاتووچۆی دیوەخان نەکەن و قاوەی ئاغانەخۆنەوە، لەزۆربەی گونـــدەکان فەلاح دیوەخانیان بۆخۆیان چێ کردبوو، دیوەخانی ئاغای گوند بێجگە لەچەند کەسانێکی گۆردەو بەرماوە و چڵکاوخۆر، ئەگینا دیوەخان ســـاردو چۆڵ بوو، ببووە مەیدانی جلیتبازێنی مشـــکانبەڵام لەگەڵ ئەوەشـــدا ئاغاکان بەپشتیوانی (میریی)پشـــت ئەستووربوون، دڵنیابـــوون کە ئەم بارودۆخـــە زۆر ناخایەنێ، ئەگەرچی ئەو ڕاپەڕینە شەســـت ناوچەو نزیکەی دووســـەد گوندی گرتەوە، بەڵام لەڕاســـتیدا چونکی فەلاح بێ پشت و پەنابوون، زۆری نەخایەند دامرکاوە.

وابوو هێدی هێدی پشتیان دا، پەیتا پەیتا لەسوێندەکەیان پاشگەز دەبوونـــەوە، هەبوویـــەدزی، هەبوویە ئاشـــکرا، هەبوو بەشـــەرمەوە دەچوونەوە بۆدیوەخانی ئاغـــا، دیوەخان جمەی دەهات گەرم ببۆوە، لـــەو ئاواییەی ئێمە تیادا ئاکنجی بوویـــن، تەنها مامەم و مام حەمەد کەپووچـــرادان، ســـەریان بەدیوەخانی ئاغا دانەگرتـــەوە، ئیتر مامەم کەزانی دەهۆڵ درا تەقەی برا.

ڕۆژێکیان چووبوو بۆ شـــار، هەرئـــەوڕۆژە دانی هێواری، دەمەدەمی زەردەپـــەڕی خۆرئاوابـــوون هاتەوە، ســـەرلەهێواری لەگـــەڵ دایکم شرۆشـــیتاڵ و پریاسکەیان پێچاوە، سبەینێ زوو دوایی نوێژی بەیانی، کەلوپەلەکانیان لە (پەست)ی مەولودبزن بارکرد، ئیدی لێ سواربووین شارخۆت بگرە واهاتین، من لەم بارکردنەمان بۆ شار، تەنها لە خەمی کۆترەکانم دا بووم، کۆترەکیویلکەیەکی نێرە ئاشـــقی کۆترەکی مێیەی خۆمانەببـــوو، پێکەوەجووت ببوون، کۆمەڵێـــک نەوەیان لێکەوتبۆوە، کەلەئاوایـــی بەدەرکەوتین ئـــاوڕم داوە، کۆترەکانم لەتاقی ئاســـمان بەشـــێنەیی دەهاتن و دەچـــوون تەقڵەیان لێدەدا، ئێســـتاش گریانم دێ بۆیـــان، هەنووکەش بەم ڕیشـــی چەرمـــووەوە کەکۆترێک دەبینم بەئاسمانەوە جەرگم ژان دەکاتخەفەتباردەبم، چونکی نازانم کۆترەکانم چیان بەسەرهات.؟؟

- ١ -

لەلاپەڕگـــەی شـــار لەحەســـارێک بنـــەو بارگەمان بەعـــاردی دادا، حەســـارێکی گەورەو چوارگۆشە بوو، پتر لەبیســـت خانەوادەی هەژارو لێقەوماوو بێ دەرەتانی تێدابوو، سەریان پێک وەنابوو، بەنەمری و نەژی داوەڕابوونەوە، بەندە ئەو حەلە هێشـــتاکە لەلادێ بووین دوور لەڕووتان شـــەیتانی ببووم، لەبیرمە بۆیەکەم جار کەشـــەیتانی بووم، شـــەیتانم بەکەنیشکەکەی مام (عەبە دوو کورتەک)پێ پێکەنی، ناوی (شۆڕێ)بوو، زۆرجوان و نازداربوو، ئەم ناوە هەر لەخۆی دەهات.

دەســـتم داری گرتبوو، لەشـــار لەسەر ســـێنی چوکلێتم دەفرۆشت، نەخێر، سنیمان نەبوو، (لەنگەری)یەکی پەلمان هەبوو، لەسەر لەنگەری بنیشتی (ئەبوســـەهم)م دەفرۆشـــت، لەمەیدانی کەرفرۆشـــان و مەیدانی دارفرۆشان و کافرۆشان لەدەوروو پشتی شێخەڵلا، یاڵڵا بنیشتیاڵڵا بنیشت بنیشتم دەفرۆشت.

بەڵام هەرچی مامەم بوو، دەچووە کۆڵهەڵگری، یان دەچووە (کەیاری)

گەنــم و جــۆو دانەوێڵــەی دەور دەکردەوەلــەوەرزی مــەڕ بڕینەوەش دەچووە (جەوبــڕی) جەوبڕێکی دەســت گەرم و لێهاتــوو بوولەگین بوو هێدی هێــدی پەڕوباڵمان بێتەوە، لەگەڵ نــەداریماڵی خۆمان بکەین، بەڵام شــەوێکیان لەکت و پڕی دایکم ســەری نایــەوە، بەکۆچی دوایی دایکم شــیرازەی ژیانمان لەبارێەک هەڵوەشاوە ماڵێکی ساردوسڕ، ماڵی بێ کابان چەشــنی ئاشــی ئاولێبڕاوی وایە، ئەســڵەن دەبێتە گۆڕەپانی جلیتبازێنی مشکان، بۆیە مامەم ناحەقی نەبوو هەوای ژنهێنان کەوتبووە کەللەی، دەروجیران و ناســیاوی ڕاســپاردبوو ئەگەر ئافرەتێکی سەرە لەخۆگەڕابێتــەوە، وابــێ لەڕدێنی ئەو بوەشــێتەوە، دواجار چارەنووس وابوو، بێوەژنێکی تەڕیان بۆ دەست نیشان کرد، ناوی (زینەت خان)بوو، لەقێــز بەلەی دابایە دەیپەڕاند، ئیدی ماڵەکەمان گەرم بۆوە، ســەرمان پێکوەنابوو، ئافرەتێکی ڕووخۆش و میهرەبان بوو، ئولفەتم پێوە گرتبوو، ڕەحمەتی دایکمی لەبیرم بردبۆوە، زینەت خانی زڕدایکم هەربەخۆی سەری لەبەر سەری مامەم نابوو هەراسانی کردبوو، دەیگۆت:ژنی بۆبێنە.

هەربەخۆی کچێکی ڕەش ئەســمەری جوان و شــۆخ و شــەنگی بۆم دەست نیشان کرد، ناوی (ڕەحمەخان)بوو

درێــژی دادڕی خۆش نییە، پێنج شــەش مانگ بەســەر شــایی و زەماوەنــدی من و ڕەحمەخــان تێپەڕی بوو، لەگــەڵ ماڵی مامەم یەک مەنجەڵ و یەک سەرشــۆرک بوو، مامەم بەناوساڵدا کەوتبوو کاری کۆڵ هەڵگری لەگوڕوتین و لەشــەوکاری کەوتبوو، بەڵام زینەت خانی زڕدایکم هێشــتانەکێ وەبەریەوە مابوو، ئافرەتێکی بەلــەڕەش بوو، بەژن و باڵا بەرز، توندوتۆڵ بوو، هێشــتانەکی ئاگری گــەرم و دڵ تەڕبوو، بەجۆی نەدەدا، ئەو شــوڕە شوڕەی ئاوی مەلەوانی پێش بانگی بەیانییانی من و ڕەحمەخانی هاوسەرم، بەئاشکرا دیاربوو هەراسانی کردبوو، کاری لەهۆش و مۆخ و ئێســقانی کردبوو، لەحەزمەتان دەبنێســا، بۆیە لەڕەحمەخانی هاوێتبووە ملان، بەپرتەو بۆڵەو هەنجەت پێکردن کەوتبووە قوونەشــەڕ، نەخێر، کار گەییە شــەڕە چەپەڵــۆک و چنگەقژەو تیتک ڕنانەوە، لەتام

دەرچوو بوو، کەڵکــی گوزەرانی پێوەنەما، خواردن و خواردنەوەمان لێ ببووە قوزەڵقورت و ڕششـــاوو زەقنەبووت و ژەهری مار، لەم نێوەندەدا مامەم دەستی کەوتبووە بن بەرداش تێمابوو لاتوجومی نەدەکرد، دواجار ڕۆژێکیـــان ڕەحمەخـــان پێی گوتم: (دایکم مرێ، باوکـــم مرێ یان ماڵم بۆجیادەکەیتـــەوە خانووم بۆ دەگری یانیش دەچمەوە ماڵی بابم، خۆمن بەدەل خوێن نیم، بەدووش نەکەوتووم چاوبەرەژێربم).

ئیتر ئەوەندەی من خۆم دەخیلی کرد لێی پاڕامەوە ئارامت بێ، نەخێر بوخچەی پێچابۆوە لە پێشـــەخۆی دانابوو، وایدەزانی گوێزی بۆدەژمێرم، نەهاتە ڕایێ، ناچار سواڵکەر ئاسای بە کۆڵانان کەوتم، لێرەو لەوێ بگەڕێ و بســـوڕێ ژوورێکی چۆڵ دەســـت کەوێ، بەڵکو لـــەم دۆزەخەی زینەت خـــان و ڕەحمە ڕزگارمان بێ، خواوڕاســـتان ئافرەتێک بەناوی (هەیبەت خان)دڵی نەرم بوو، هەرلەحەوشەو خانووبەرەی خۆی تیایدا دانیشتبوو، ئەویـــش تەنیاباربوو، بەکرێ ژوورێکی پێدایـــن، لەچەقەچەقی زڕدایکم قوتاربووین.

هەیبـــەت خان، ئەگەرچی بەناوســـاڵدا کەوتبوو، بـــەڵام ئافرەتێکی سووروســـپی چاوشـــین پرچ زەرد بوو، چونکی زاوزێی نەکردبوو، هێشتا تەڕو پتەوبوو، ســـمت و ســـاتانێکی بەرداش پێوە بوو، ئاشگێڕێک ئاوی ڕادەکێشا، تابڵێی هێمن وئارام و لەسەرخۆو چاو تێرو دڵ فرەوان، بەرێزو تێکەڵی بوو، چوارمانگ بووکرێچی هەیبەت خان بووین، کرێی دوومانگی قەرزداربووین.

بالێرەوە لەســـەر ئەم قەرزدارییـــە و کرێچیایەتی هەیبەت خان، ئەم لاپەرەیـــە دادەینەوە، باهەموومـــان پێکەوە بچیـــن لاپەڕەیەک لەڕۆژان و زەمەنـــی کوڕیژگەیی، یـــان بڵێن جوانکەیی من هەڵدەینەوە، پاشـــان دەگەڕێینەوە ســـەربەزم و ڕەزمـــی ڕەحمەخانی هاوژینم و هەیبەت خانی تەڕپیـــرو نمەک حەڕامی من، هەنگێ بزانیـــن ڕۆژگارو چارەنووس بەچی دەگات.؟!

کەلەلادێـــوە هاتین بۆشـــار، ڕەوشـــتی گەنجانی گوندو لاوانی شـــار

بەفروتەنی بوو، من تازە هەڵدەچووم، گەنم ڕەنگ و خڕپن وپێش چاوبووم، هەستم پێدەکرد هاوتەمەنەکانم بەچاوی گورگانە سەیرم دەکەن، نیازیان خراپ بوو، بەڵام هەرچی من بووم، ڕەحمەتی دایکم وەهای پێچابوومەوە، لەســـەر پشتی لانک مەپرسە، توندو تۆڵ، گورج وگۆڵ، زیت و جەربەزە، وەک پەلیک هەڵکەوتبووم، دایکم بەلایلایەو سەردولکەی نەبەردی گۆشی کردبووم، لەبیرمە دەیفەرموو.!

(کوڕم گەورەبی دەبیتە شوان
خەنجەرلەکەمەر بڕنۆ لەشان.
مێگەڵ ڕادەدا بۆ شەوین و شیوەخوار
ڕێ بەگورگ نادا لێی بدزی بەرخ وکار)

هەرئەوەش بوو من هێندە (دڕ)و شەڕخوازبووم، هەرگیز جەسارەتیان نەدەکرد لێم نزیک ببنەوە چاو شـــکێن و جووجەڵە ترسێنم بکەنیەکێک لەوانە ئاوقەرانی خۆم بوو، ناوی (کانەبی)بوو، بە (کانۆ) بانگیان دەکرد، کانـــۆ گەنجێکی حولحولی تامگێل بوو، زۆرجـــاران هاوتەمەنەکانی خۆی ناوی کچێکیان لەپشتی وێنەی کچە ئەکتەرێکی میسری دەنووسی، لەگەڵ نامەیەکی دڵداری دەیانخستە ناو زەرفێکی کاغەز

(( ئەوسا نووسین لەسەر زەرفی نامە بەزمانی عارەبی بوو، جائەگەر نامەکە هەرلەم شارەوە بۆناو شارو لەڕێگەی پۆستەوە هەناردبات، دەبووایە لەسەر زەرفەکە بنووسی (منها والیها) لەگەڵ ئەدرەسی تەواو.))

ئەوجا کوڕگەل، ناونیشـــانی چایخانەی گەڕەکیان لەســـەر زەرفەکە دەنووســـی، بگات بەدەستی بەڕێز(کانەبی حاجی برایم) پاشان دەیانبرد بۆ فەرمانگەی پۆســـتە، پولێکی (٥)فلســـیان لێدەداو دەیانخســـتە ناو سندوقی پۆســـتە، دوای دووسێ ڕۆژ پۆستەچی نامەکەی دەهێنا، کانۆ، کەنامەکەی بەدەست دەگەیی لەخۆشیان شێت دەبوو،کانۆ، نەخوێندەوار بـــوو، ڕووبەڕووی هەر خوێندەوارێکی ناســـیاو بووایە، دەســـتی دەگرت دەیبـــردە پەناگەیەک پێی دەگوت: ئەم نامەیەم بۆ بخوێنەوە، هەرلەپای ئەم نامانەوە بوو ناوی (گێلە)یان بەسەریدا بڕاندبوو، وابوو ڕۆژێکیان گێلە

دەچێتە ناو بازاڕ، لەم شـــەقام بۆ ئەو شـــەقام تەقالای (ئەنوەر)ی وێنە فرۆش وێنەی ئەم کچە دەبینی داندراوە بۆ فرۆشتن، وێنەیەکی لێدەکڕێ، پاشـــان دەگەڕێتەوە بۆلای هاوڕێیەکانی، هەرچی جنێوی ناشـــیرینە بۆ گۆڕی ئاجەراتیان حەوالّـــە دەکات، ماوەیەک لێیان بەدوور دەکەوێتەوە، دواتر برادەرەکانی هەرچۆنێکی هەبوو ئاشـــتیان کردبۆوە، دوای ئەوەش وێنەی کچە ئەکتەری هەرلەلای مابوو، دەیگووت (( خۆشم دەوێی)).

لەو ســـاتەوەختەی ئێمە تازەماڵ و بێ ئیشوکار، قەرزداری هەیبەت خـــان بووین، لەحەژمەتان وێک هاتبوومـــەوە، دۆش دامابووم، هاکادیتم ڕۆژێکیـــان گێلە پەیدابـــوو، دوای هەندێک فشـــەوگاڵتەو گەپ، پێکەنی گوتی، دەزانی نیازی سەفەرم هەیە، دەچم بۆ ئەداکردنی فەریزەی حەج، من و تۆش ســـەردەمانێک برادەربوویـــن، جابۆیە هاتووم بەڵکو گەردەنم ئازادبکەی، پێم گوت: ڕاســـتە برادەربووین، بەڵام خۆمن شیری سپیم پێ نەداوی، لەجیاتی جارێک سەدجار گەردەنت ئازادبێ، بڕۆ ئۆغرت خێربێ، بەخێربچی بەسەلامەتی بگەڕێیتەوە، گوتی:ئاخر دەزانی چییە.؟! حەقت بەسەرمەوەیە، لەوانەیە ئەوەی من دەزانم، تۆ نازانی، بۆیە دەڵێم گەردەنم ئازادبکەپێم گوت: تێتناگـــەم گێلە، ئەوەی تۆ دەیزانی من نایزانم، یانی چی.؟! دیقەتم دابووێ گێلە لەقسەکردنا شپرزەو زمانی دەگیرا، دەیگوت ( (ئاخرئاخرنازانم کووکووکوویی پێت بڵێملـــەڕووم نایە، نازانم کووکوو حاڵیحاڵیت بکەم ))؟!.

دەمارم لێی جووت بوو، لێی هەستامەوە سەرچۆک، پێم گوت: دەزانی چییە گێلە، سەلیقەی کووکوومووکووی تۆم نیە، دەیڵێی، بیڵێی، ئەگەرنا وات لەحاڵی.! گوتی: دەیڵێم، بەڵام

قســـەم پێ بڕی، پێمگوت: بەڵام و مەڵامی پێنـــاوێ گێلە، دڵنیابەو بیڵێ و بڕایەوە.! دیســـان دەستی پێکردەوە، ئاخرئاخر وەڵڵاهی لەڕووم نایە،نازانـــم کوو حاڵیت بکـــەم، هەرچەند دەکەم بەســـەرزمانم دانایەت بیدرکێنم.

تاوێ دامام، جگەرەیەکم داگیرساند، دووسێ مژم لێدا، دواتر پێمگوت:

قەیدی ناکات، مادام بەســـەر زمانت دانایەت، فەرموو بەنووسین، لەسەر کاغەز بۆم بنووســـە، لەقاقای پێکەنینی دا گوتی: بێ ئەقل من چووزانم بنووسم و بخوێنمەوەلە دڵی خۆم داگۆتم ئەوەیە دەڵێن ((قەل بە قەلی گوت ڕووت ڕەش بێ)) پێمگوت باشـــە جەناب فەرموو چەشنی کەڕوڵاڵ، هەرچی هەیە بە ئیشارەت پێم بڵێ.!

تاوێ داما بیری لێکردەوە دواترگوتی: زۆرچاکە فەرموو تەماشاکە.

چاوی هاوێتە ســـەریەکدی، ڤێجا دەســـتی کردە پرخە پرخ و منگە منگ و هێـــدی هێدی وەکو سەگســـار دەیژەنی، گوایە خەوتـــووە خەون دەبێنێ، پاشان چاوی هەڵێنا لەسەگ ژەن کەوت، گوتی: بەزاتی خودا ئیشی شەیتان بـــوو، ئەو مەلعونە پێی کـــردم، کەبەئاگاهاتم ناوپســـتێری خۆم ڕاگێڕابوو، زۆربەخۆمدا شکامەوە لەشەرمان.

ـ ئێستا حاڵی بووی.؟!

ـ نەخێر، شەیتان و مەیتان و مەلعونی چی.؟!

تاوێ داما، سەری خوراند، دواتر پێکەنی گوتی :

ـ باشە ئەتوقەت شەیتانت پێ پێنەکەنیوە.؟!

ـ بامن بە کچان شەیتانم پێ پێکەنیوە،

ـ ئێڕاستە شەیتان هەوەسی لێ بێت دەچێتە سەر شکڵی کچ، جاری واشە هەر بۆ ئەوەی زەلە بەپیاو بکات، دەچێتە ســـەر شـــکڵی کوڕو دەستخەڕۆی دەدات، وابوو شـــەوێ لە شەوان خەوتبووم، ئەومەلعونە لەشێوەو شکڵی تۆ هاتە خەونم، کەبەخەبەرهاتم کارلەکار ترازابوو، بەڵام گوناحی من نەبوو، کاری شەیتان بوو پێی کردم، بۆیە خێرتەگاتێ ئەگەر گەردەنم ئازاد بکەی.؟!

دەفەرمـــوو ئەرباب تۆ بڵێ: دڵت چـــی دەوێ؟! وەرە لەگەڵ ئەم گێلەیە تێکەوفرکە، یان وەکو دەڵێن! ((گونی بگرە دەســـت نوێژت نەشکێ))کەچی لەگەڵ ئەوەشـــدا خۆم لەگوورە نەبرد، لەدڵی خۆمدا گوتم: وادیارە ئەم گێلە تاگـــەورە دەبێ گێلتر دەبێت، کەتێفکریم لـــەم تەنگانەیەدا نێچیرێکی قەڵەو و چەورە، ڕســـقەو هاتووتە بەردەســـت، واچاکە لەدەســـتە خۆمی نەدەملێم پرسی:

- ئەریٚ چەند ساڵ بەر لەئەمڕۆ بوو کەشەیتانت بەمن پیٚ پیٚکەنی.؟!
- ئەوە لەزەمەنی هەرزەکاری دابوو، چارەسەر دەکریٚ،
- چۆن چارەسەردەکریٚ؟!

مـــن بەدریٚژایی ئەوماوە زەمەنییە، بەگیانی پیس و قەلبی بیٚ نویٚژی، بەسەر ئەم خاکە پیرۆزە دا دیٚم ودەچم، ئەم خاکە لەژیٚر پیٚم دا زیرەو دادو فیغانیەتی، ڕۆژی پیٚنج جار بەبیٚ دەســـت نویٚژ چوومەتە لەسەر بەرماڵە نویٚژ، لەحزور پەروەردگار ڕاوەســـتاوم، مەعلومە بۆیە خودا غەزەبی لیٚم گرتووە، ماندی و شەقی، کەچی ڕســـقم هەرسوارەپیٚداچووم گوتم: ئەم هەموو مانگی ڕەمەزانە بەگیانی پیس و بیٚ نویٚژی بەرۆژووبووم، تۆ بڵیٚ بەرازی دەم بەستراوە، کووا من ئەوەندەم تەمەن وەبەرماوە، ڕۆژووەکان بگرمەوە ونویٚژەکان (قەڵلا)بکەمەوە.؟! وای لەم غەدرە، ئای لەو زوڵمە، ســـەرباری ئەم هەموو زوڵم و قوڕەشـــین وچڵپاوە، جەنابی ســـەڵلانە، سەڵلانە هاتووە، داوادەکات گەردەنی ئازادبکەم.

ئیـــدی بەم قســـەزلزل و هۆقەبازیانە تەڵەم بۆ گیٚلـــە داناوە، گیٚلەم خســـتەداو، گیٚلە بەئەسپایی دەستی خستە سەرشـــانم گوتی: برا،پەک ناکەویٚ، ئیش بەپارەپیٚک بیٚت خەم نییە.

ئیتر بانەبیٚتە هەقایەتی میٚشـــیٚ، گیٚلەیەک بەســـتە دیناری ئاخنییە باغەڵم،گوتی: هەژار و مەلای دەســـتکورت زۆرن، بەم پارەیە مەسەلەی قەڵلاکردنەوەی نویٚژەکان و ( (کەفـــارەت))ی ڕۆژووەکانت پیٚ ڕایی بکە، پاشان گوتی: ئەوجا فەرموو گەردەنم ئازادبکە، بامنیش دڵم دابکەویٚ.!

پیٚمگـــوت: گەردەنت خۆش و ئازادبیٚ، ئۆغرەت خیٚربیٚ، خودا حەجت لیٚ قبووڵ بکات، کەوام گوت! گیٚلە هەردووچاوی پڕی فرمیٚسک بوو،گریان هەوکی گرتبوو لەخۆشیان، دواجار یەکترمان ماچ کرد، بەخۆش حاڵییەوە بەریٚمکرد ڕۆیی.

قەت بەدرۆ نەیانگوتووە ( (ماڵی نەخۆری بۆچەکمە سۆری تەقە تەق دەکات)).

بەڵیٚ گەلۆ، لەســـایە ســـەری گیٚلە گیرفانم گەرم داهات، جاریٚ زوو

قـــەرزی دوومانگ کرێی خانووم دابـــە هەیبەت خان، دواتر هەیپام لێکرد بازاڕخــۆت بگرە واهاتم، شـــەیتان (پاشـــپەڕ)ی کـــردووە، پارەی بۆم هەنـــاردووە، ئیتر هەرچی دڵم چووێ، خۆ ئارەقـــەم پێ نەکردووە، بێ دڵی خۆم نەکرد، ((بازۆکیری ئەمڕۆ بەقینگی ســـبەینێ)) هەڵبەتە لەم دەســـتکەوتە مەزنە، ڕەحمەخانی هاوسەرم بێ بەش نەکرد، ڕۆژی پاشتر قۆڵمان تێک هەڵکێشـــا ڕۆیشتین بۆ بازاڕ، دەستە جلێکی جوان و نایابم بۆی کڕی، باسەرتان گێژنەکەم، ماوەیەک بەکەمالی ئیسراحەت بەپارەی گێلە قەتاندمان.

-٢-

بەندە، سبەینان زوو بەرەبەری بەیانییان، ئەودەمەی سەگ وگورگ لێک ئاشـــکرا دەبن، لەگـــەڵ مەلا بانگدان بەپەلە پڕووزە لەبن شـــڕە جاجمـــی حەوت ڕەنگ قیـــت دەبوومەوە، (ئـــەو جاجمەی ڕەحمەتی دایکم لەکاتی سەرەمەرگدا وەسیەتی کردبوو بەبۆنەی هاسەرگیری من، پێشکێشی بە دەستگیرانم بکەن)

کە لەخەو هەڵدەســـتام، خۆم گورج و گۆڵ دەکرد، ڕەحمەخانیش بەتەرپدەســـتی (نوردی)یە نانێکی گـــەرم و هەندێک پێخۆری دەکردە پریاســـکەو هەتـــا دەرگای حەوشـــە لەگەڵم دەهات، پریاســـکەکەم لێوەردەگـــرت، هەیپام لێدەکرد بۆ گۆڕەپانی کرێـــکاران، گۆڕەپان چ گۆڕەپان؟! جمەی هات، دارت هەڵدابا بەعاردی نەدەکەوت، کرێکارەکان چاویان دەبڕییە زارکی چایخانەکان، چاوەچاو بوون تاکو وەســـتاکان بەکاوەخۆ قاوەڵتیان دەکرد، چونکە هەرچی وەســـتاکابوون دەچوون

لەچایخانەکان لنگ لەسەر لنگ، بەڕا لەخۆبوونەوە دادەنیشتن، کولێرەی گـــەرم و چایەو کوبەی برنج و کوبەی بە هوردە گۆشـــتیان دەخوارد، دواتـــر جگەرەیەکیان بەلالێویانەوە دەگـــرت، بەنازوفیز دەهاتن بۆلای کرێکاران، وەســـتاکان، کرێکاری خێتگرو کرێـــکاری قوڕپانکردنەوەی پێش دەســـتی وەســـتاو خەلفەی تایبەت بۆ لێدانـــی چینی ناوەوەی دیوارو کرێکاری هەڵدانی کەرپووچ بۆ دەستی وەستا، ئەوانە هەموویان کرێکاری هەمیشـــەیی بوون، بەزۆری و کەس و کاری وەستاکان بوون، قەت بێ ئیش نەدەبوون، ئەوانە ڕۆڵی مامەحەمەیی و ماستاو چیەتیان دەگێڕا، کلکەسـۆتەییان لە بەروەســـتاکان دەکرد، بۆیە هەرگیز بەبێ کارنەدەماوە، سەیر لەوەدا بوو!

ئەو گۆردانە خۆیان لە کرێکاری ئاسایی بەگەورەترو لەپێشتردەزانی، لێیـــان لابەلاو خۆفەڕنو لالووت بوون، جاکە جەنابی وەســـتا یاغریاغر دەهات بۆ گوڵبژێری کرێکاران، وەکو چەرچی مەڕوماڵات و ڕەشەوڵاخ، چۆن لەمەیدانی ئاژەڵان بەناو مێگەڵ دەکەون، بەهەمان شـێوە بەناو کرێکاران دەکەوتن، جەنابیان بەپەنجەو سەرلەقاندن!!

(تۆ وەرەتۆتۆتۆش وەرەتر) جاری وا دەبوو کەوەســـتا بەپەنجەی ناموبارەکـــی ئاماژەی بۆ کرێکارێک دەکـــرد، کەچی کرێکارێکی دیکە بەســـەهوو دەچووە پێش، وەستا پێی دەگوت: لەگەل تۆم نەبوو، ئەو کرێکارە داماوە هەناسە سارد دەبوو، دەتەزی لە حەژمەتان، ئیدی لەگەڵ گەزەنگی خۆرەتاو تاوەکـــو زەردەپەڕی خۆرئاوابوون وەکو وڵاخی بن دۆڵاب دەیانڕەتاندن، لەبەرامبەر پارەیەکی کەم خوێنیان لێوەردەگرتن، جاری وادەبوو کەســـبەینان دچووین بۆســـەر ئیش، کاتژمێرێک، پتر کەمتر خەریکی کارکردن بووین، کاتێ کەخاوەن کارتەشـــریفی دەهێنا بۆ سەرکار، ســـەرژمێرییەکی کەرپووچ کێش و قوڕکێشەکانی دەکرد، نێوچەوانـــی گرژومۆن دەبوو لۆچی تێدەکـــەوت، ڕووی دەمی دەکردە وەستاودەیگوت!

(باوکم خۆمن ( (ئەحمەدقەدۆ))نیم، لەسەر خەزێنەش پاڵنەکەوتووم، ئەم هەموو قورکێش و کەرپووچ کێشەت هێناوە بەخۆڕاپارەیان بدەمێ، سێ چوارێکێان بەرێبکە بابڕۆنەوە).

جارێکیان هێشـــتا ژنم نەهێنابوو، ئیشـــی قورکاریم دەکرد، وابوو ڕۆژێکیان ساتە وەختێک بوو چووبووین، بۆسەرئیش، خەریکی کارکردن و قورکێشـــان بووین، قورکێشـــەکان هەموومان هەرزەکاربووین، دیتم خاوەن ماڵ پەیدابوو، کابرایەکی حاجی بوو، بەناوساڵ داکەوتبوو، کەواو سەڵتەی پۆشی بوو، حەراییەکی لەپشتی بەستابوو، یەکێکیشی لەسەر ئالان دبوو، (یەمەنی)یەکی ســۆری لەپێی دابوو، زەلامێکی کورتەبنە بوو، کت ومت زەلامی ناوچاوی (ئایشـــەگوێدرێژ)بوو، کەهات دیقەتم دابوێ هەستم پێکرد حاجی هەر بەچاو سەرژمێرییەکی قورکێشەکانی کرد، دواتر چوو بەسرتەهەندێک فسکە فسکی بەگوێی وەستادا چرپاند، چاوم لێبوو، وەستا سەری ڕەزامەندی بۆ حاجی ڕاڵەقاند، دواتر وەستا بانگی من وســـێ قورکێشـــی دیکەی کرد گوتی (دەست بەردەن، بڕۆن دەست و پلتان بشۆن پێویستمان پێتان نییە بڕۆنەوە).

هەرچوارمان هەناسە ســـاردبووین، بەنابەدڵی قاپی قورکێشانمان دانا، چووین لە (ئەســـتێل)ەکە دەستی خۆمان شووشت، کزومەلوول ڕۆیشتین.

ئیشەکە دورست کردنی خانووبەرە بوو، کەوتبووە پشت حەساری حەمەدئاغا، نک ماڵە کورەچییەکانی گەڕەکی کەرتۆپی لەسەعدوناوە، ئەو شوێنە پڕکەرتەکەرپووچ و پارچە تاسوڵقەبوو، چەند شەقاوێک لە شوێنی ئیشەکە بەدووری کەوتبووینەوە هەربەرێوە بیرم کردەوە! کات چێشـــتەنگاوێکی قایم بوو، کەڵکی ئەوەی پێـــوە نەمابوو بچینەوە بۆ مەیدانی کرێکاران، نەخێر درەنگە، تۆزێک سەنگرامەوە، نەخێرلە جێوە چەقیم، هاوکارەکانم پرسیان: هابۆچی ڕاوەستای.؟!

گوتم: لەهێوارێـــوە هەزار دوعاونزامکردووە، لەخوداپارامەوە بەڵکو

سبەی کارێکم دەست کەوێ، دوعاقبوووڵ بوو، بەڵام عەبدی چاوچنۆک برِی.گوتیان،

ـ ئەوە برِی، ئایا چمان لەدەست دێ.؟!

ـ بەڵێ، ئەگەر بەقسـەم بکەن هاوکارم بن، دەسـت بدەنەدەستم زۆرشتمان لە دەست دێ، ئەگەر مەرامەمان بێ.؟!

ـ باشە وەکو چی.؟!

ـــ ناهێڵیـن کاربکەن، سـەیرکەن! ئـەم ناوە هەمـووی خرِکە بەردوکەرتەکەرپووچـە، هەرچـوار لایان لێدەگریـن، دەیاندەینە بەر بەردان لە ئیشـیان دەکەین، واز ناهێنین یـان دەبێ نیوە رۆژانەمان بدەنێ، یانیش ناهێڵین کەرپووچ بخەنە سەرکەرپووچ.

ئیتر هەرچوارمان دەست لەناو دەست بەڵێنمان دا دەست پێ بکەین، هەرچوارلامان لێگرتن، دەنگمان دان و دەسـتمان پێکرد، سێرەمان لە حاجـی گرت دامانگـرت نەبەردێک و نەدووان، حاجـی خۆی دابووە پەنادیوار، هەرکەسەری دەردێنا بەجارەکی سێ چوار کەرتەکەرپووچمان تێدەگرت، حاجی دەکشاوە دواوە خۆی دەداوە پەنادیوار، وەستا لەسەر دیوار بوو، ناوناوە پرووما لە وەسـتا دەکرد،ئەومان دەکردە نیشانە، بەڵام نەک بەمەبەسـتی پێکان، مەبەستمان ئەوە بوو لەئیشیان بکەین، ماوەی نیوسەعاتێک نەمانهێشت کەرپووچ بخەنە بان کەرپووچ وەستا هانی کرێکارەکانی دەدا راوەدوومان بنێن، یان بمانگرن، کەکرێکارەکان بۆمان دەهاتن بمانگرن، ئێمە پێمان پێوە دەنا بەدووردەکەوتینەوە کە ئەوان دەگەرانەوە، دوا بە دوای ئەوان دەگەرِاینەوە، دیسان دەستمان پێدەکردەوە، بەلام ئەوەی راسـتی بێ هەستمان پێکردبوو، پرِبە دڵ نەیاندەویسـت بمانگرن، بەڵکو بە مەبەستی چاوو راوو ترساندن بوو، ئەم قوونە شـەرِە پتر لە نیوسـەعاتی خایاند، دواتر وەسـتا دەنگی هەڵبری بانگی کردینەوەگوتی:

ـ وازبێنن، قەیدی ناکە وەرنەوە سەرئیش.

ـ نەخێر، نایەینەوە، نیـــوەی ڕۆژانەمان دەوێ، ئەگەر نا، هەرگیز وازناهێنین.

دیاربوو وەســـتا و حاجی خەریکـــی گفتوگۆ و تەگبیر بوون، بەڵام نەمانزانی تەگبیریان چی بوو؟! وەستا بانگی کردین گوتی:

ـ قەیدی ناکە لەسەرقسەی خۆتان وەرن، هەریەکەو نیو ڕۆژانەتان دەدەینێ.

ـــ نەخێر نایەین، بە حاجی بڵێ ئەو قەســـپەی ئەو خواردوویەتی ناوکەکەی لەگیرفانی ئێمەدایە، ئەگەر ڕاست دەکەن ؟!

پارەکەی بە کرێکارێک دا بۆمان بنێرن.

هەرچەندی وەســـتا وحاجی شـــێرەک لەم لاو ڕێوییەکیان لەولاوە هێنا، نەخێر ســـەرمان نە هێنا بەرێ، دەســـتخەڕۆ نەبووین، (ئەوسا ڕۆژانەی قورکێش چوار (درهەم)بـــوو، دواجار ناچاربوون وابوو حاجی دەســـتی نایەبەر باخەڵی کیســـەی پارەی دەرێنا هەشت درهەمی لێ ژمارد، دایە دەســـت وەســـتاو گوتی (هابگرە بۆیان بنێرە، بەسندان و قورزەلقورت و زەقنەبووت و ژەهری ماریان بێت، سەگبابانە خۆین بەری چاوی گرتوون).

وەســـتا پارەی لێوەرگرت، بەنیازبوو خـــۆی پارەکەمان بۆ بێنێ، بانگم کرد پێمگوت (وەســـتا، پارەکە بـــدە بەکرێکارێک با ئەو بۆمان بێنی)پارەکەی دایە دەست کرێکارێکی بە تەمەن هاوردی، نەم هێشت بمانگاتێ دەنگـــم دا (خاڵۆپارەکە لەوێ دانـــێ و بگەڕێوە)، پارەکەی دانایە ســـەر کەرتەکەرپووچەک و گەڕاوە، چووم پارەکەم هەڵگرتەوە ژماردم، تەواو هەشـــت پەنجایی بوو، دەنگـــی هاوەڵە کرێکارە یاخی بووەکانم دا، وەرنەوە وازبێنن، هاتن گردبوونەوە هەریەکە سەت فلوسم دانێ، لێماندا ڕۆیشتین.

بەڵام ئەوەی ڕاســـتی بێ، ترســـی بەیانـــی ڕۆژی ئایندە لە دڵمدا چەکەرەی کردبوو دەترسام! تۆ بڵێ وەستا لێمان خۆش بێت.؟!

بەیانـــی ڕۆژی دواتـــر لـــە مەیدانی کرێـــکاران زۆر بـــە پارێزەوە ڕاوەستابووم، چاوەڕوان بووم، بەڵکو وەستایەک بەپەنجە هەڵشەقاندن بڵـــێ (تـــۆوەرە)، نازانم کووبـــوو؟! بەچییەوە خەریـــک بووم، کاتێ ســـەرم هەڵبڕی دیدەم لە چاوی وەســـتا چەقـــی، وەلی هەرگیز خۆم شـــێلونەکردچاوم نایە دووڕ چاوی وەستای گۆرین، وەستا لە تریقەی پێکەنین دا گوتی:

- دەزانی زەرەرتان بوو، دۆڕاندتان.؟!

- تێت ناگەم، بۆچی دۆڕاندمان؟!

ئەی حەقی خۆمان لێ نەستاند.؟!

ـــ ئێوەنەتان زانی، حاجی لەرزی هاتبووێ، ئەگەر نەختێکی دیکە پـــێ گیریتان کردبایـــە، داوای ڕۆژانەی تەواویشـــتان کردبایە، حاجی ناچـــار بوو بیژمێری، چونکی حاجی لە حـــەوت ئاوی دواوە گۆزینگی تەڕنەبووە، دەیزانی ئەگەر لەســـەر داواکارییەکەتان ڕازی نەبێت، ئەو حەلە ئێمەش ناچار دەبووین دەســـت هەڵگرین، دەبوو حاجی ڕۆژانەی هەموو کرێکارەکان بژمێرێ، واتا بەم نرخە حاجی قازانجی بوولاشانێکم بۆی هەڵتەکاند گوتم:

: وەستا، لە دوای چووان مەچۆ، چونکە ئەوەی چوو! ڕۆیی هەرگیز ناگەڕێتەوە.

-٣-

گەلۆ، ڕاستە دەڵێن (( کەر بەلاباران ناگاتە هەواران )) هەر وەک لەوەپێش باسم کرد، تاریک و ڕوونی بەیانییان هەیپام لێدەکرد بۆ مەیدانی کرێکاران، ئاوی پێم دادەچۆڕا، چاوم شل دەبوو هێندەی چاوەڕوان و چاوبگێڕم، بەڵکو ئەمڕۆ وەستایەک بەزەیی بەدڵ دابێت، بەناخێری گیانی بەپەنجەی نامۆبارەکی ئاماژەم بۆ بکات بڵێ : تۆ وەرە لەگەڵ خۆی بمبات بۆ قوڕکێشان، بەڵام ئیشی چی و تەڕەسازی چی؟! ئەگەر لە حەفتەیەکدا دوو ڕۆژ کارم چنگ کەوتبایە، ئەز پاشابووم بۆ خۆم، ئەگینا هەتا دەمەدەمی چێشتەنگاو لە مەیدانی کرێکاران دەمامەوە، دواتر بەنائومێدی و هەناسە سارد، هێرتە هێرت بەخۆم و بەتورەگەی توێشووی کارەوە دەگەڕامەوە بۆ لای ڕەحمەخانی هاوسەرم لەماڵ، هەموو جارێ کە پێم لەکۆسپەی دەرگای حەوشە ئاودیو دەکرد، ڕەحمەخان، بەپیرمەوە دەهات دەیگوت ( بەخێربێیتەوە، دیارە

ئەمـــڕۆش چارەنووس وابوو، خەم مەخۆ، خودا کەریمە، تاســـەرمابێ خودا ڕسق دەدات سەری بێ ڕسق لەبن گڵی دایە).
: لەسەر حاڵی خۆم بەزەییم بەسادەیی و ساویلکەیی و دڵ فرەوانی ڕەحمەخان دەهات، پێدا دەچوو دەیگوت:
( وەرە دانیشـــە، ئینشەڵلا سبەینێ ئیشت دەســـتەکەوێ، وەرە ڕوونە، دەزانم چایەت نەخواردووتەوە، دانیشە باچایەکە گەرم بکەمەوە چایەکی خەستت بۆ تێبکەم، وابێ مێشکت بێتەوە سەرخۆ ئیسراحەت بکەی).
چـــای چی؟! هەر ترپاتەکـــەی بەیانییان بـــوو نەیدەڕژاند گەرمی دەکـــردەوە، چای چی؟! زەرتکاوێک بوو بۆ خۆی هەر مەپرســـە؟! بە هیچ جۆرێ تامی چای نەدەدا، بەڵام لەگەڵ ئەوشدا سێبووریم بەم دڵ دانـــەوەی ڕەحمەخان دەهات، هانـــی دەدام چۆک نەدەم، بەئومێدەوە بەدوای کاردا بگەڕێم، بەڵام لەشـــارەکی بێ یاســـاو ڕێساو بێ پاشا، پرکێشە و ململانێ چاوەڕێ چی بم؟! شار چ شار؟! شارێکی ڕووت و قووت، دەنگی ئامێری کارخانەیەکی بەرهەم هێن چییە؟! نابیســـترێ، بێجگە لە دووکەڵی کووڕەی کوورەچییەکانی دەوروبەری شـــار، لەگەڵ دووکەڵی کوورخانی گەرماوەکان ئاســـمانی شاریان داپۆشیوە، ئەگینا چڕە دووکەڵی یەک دەزگا پیشەســـازی چییە؟! نابیندرێ بەئاسمانی شاردا هەڵچووبێت، شارێکە (تا) دارو دووچاری سێبەڕۆش بووە، ژیان تیایدا بەمردوویی لە دایک دەبێت، شـــارێکە پشـــتی لە پێشکەوتن و شارستانییەت و جوولەو گەشەی ئابووری کردووە، بێجگە لە پیشەی خم چییەتی، ئەویش پاشـــماوەی ( جوولەکە)کانە، دوابەدوای دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسرائیل و ڕەوکردنی جوولەکەکان بۆ ئەوێ، جائەوەی دوای جوولەکەکان دەســـتی لەپیشەی خم چییەتی گیربوو، وەک ئەوەوابوو دەستی بەســـەر گەنجینەی قاروون داگرتبیت، ئەگەرنا، ئەوەیان پینە دۆز، ئەوێهێ چایخانە و هەندێک هوردە پیشەی سادەو ساکارو دەست

کارو هیچی تر، بۆیە ئێمە مانان لەم شارەدا لەسەر قەرزوقۆڵە دەژین، قەرزیش، قەرزی بێنەونییە، فەرموو! بەتەمای قورکاری پۆشاکی بەرم هەموو بە قەرزە، بە قەرز خۆم داپۆشـــیوە، قەرداری کوتاڵفرۆشـــم، قـــەرداری گۆشتفرۆشـــم، بگرە هەتا دەگاتە لانکـــی نۆبەرەکەمان نک دارتاشـــی گەڕەک بە قەرزە لەســـەرم، کەتوومەتە بـــن باری قەردان، لەترسی خاوەن قەردان قەت نەدەوێرام بەڕۆژی ڕووناک تخوونی ماڵی خۆم بکەومەوە، بەتایبەتی لەترســـی قەساب و ڕەجەبەشێتی دارتاش لەترسی ئەم دووانە بە ڕۆژ ئەشقیابووم، تاریک بۆ تاریک دەچوومەوە ماڵێ، نۆبەرەکەمان بازەرە ببوو، بانگم دەکرد لە هامێزی خۆمی بگرم، ناحەقی نەبوو لە هاڕژنی گریانی دەدا، بە هەڵە داوان خۆی لە باوەشی دایکی دەکوتاوە، توند خۆی بە بەرۆکی داکییەوە دەقرپساند، ئەگەر لە دەمەساتی ئەنگۆرەی هێواران، یان پێش تاریک کەوتنەوە چووبامەوە، ناچـــار ڕێ گۆریم دەکـــرد، نەبادا لەهیکەوە.بکەومە داوی قەســـاب و دارتـــاش، بۆیە لە خـــودی خۆم لە ژیانی خـــۆم دا وەڕس ببووم، لە گیژاوی ئەم بارودۆخەدا مێشـــکم لەق ببوو لە کارکەوتبوو، بگرە جاری وابوو ناوی جگەرگۆشەم لێ تیک دەچوو لە بیرم دەکرد.

ڕۆژێکیان بەم سەر لێ شێواوییە سەری گلۆڵەم لێ ون بوو، مەسەلەی قەرزو خاوەن قەرزم لە بیرچووبۆوە، دەمەوســـاتی چێشـــتەنگاوێکی درەنگ، هەردوو دەســـتم لە پشتڕاتێک ئالاندبوو، کلاوم هێنابووە سەر ئەبـــرۆم، یاغر یاغر بەفیکەفیک بەرەو ماڵ ملم پێوەنابوو، لەبیرم چوو بوو ڕێگە گۆری بکەم، بە پەنادزەو بە نێوان کۆڵان و پاشماوەی خانووە کەلاوەو دارماوەکانی جوولەکەکاندا بڕۆمەوە بۆ لای ڕەحمەخان، یارەبی خودایە ئەوەی من دیتم و لێم قەوما و بەســـەرم هات، بەسەر شەیتان و کافری زەندیق نێت، نازانم ئەسپی خەیاڵم بەرەو کوێ باڵی گرتبوو، ئەو دەمە هشـــیاربوومەوە هەندەی نەماوە بگە مە بەر دەرکی دوکانی خولەی قەساب، (سەبارەت بە قەرزی خولەی قەساب و ڕەجەبەشێتی

دارتاش و هەموو خاوەن قەرزەکان، ئەوەندەم درۆی زلزل و نەقولآم لە ڕوویاندا کردبوو مەپرسە، بام لە حەسەن درۆزن بڕی بوو).

بۆیە زانیـــم لەوزەیاندا نەماوە، فرت و فێـــڵ و کەڵەکەبازی چیتر ســـەر ناگرێ، خولە دەســـتی بمگاتێ شوورت و شـــۆم دەشکێنێ، لە ترســـان بامداوەو پێم پێوەنا دامە بەر نەرمە لۆقە، خولە بە دوامەوە بـــوو تەقلەکووت دەهات، نەخێر، پێم هەڵگرت وەکو وڵاخی چەمووش تازە پشـــت کرابێت ڕمبەم لەعاردیەوە دێنا، لەم کۆڵان بۆ ئەو کۆڵان، هاوچەشنی ڕیوی و تاژی سەرادووی نابێت، پێچاوپێچم دەکرد، نەخێر بێ هوودە بوو،خولەی قەساب هەر بەدوامەوە بوو هاواری دەکرد! (بۆم ڕاوەستە ســـەگی سەگباب نەڕۆی، گۆشـــتی من زەقنەبووت دەکەی، کەچی سەرباری ئەوەی پارە نادەی دەستی دەستیم پێدەکەی).

لـــەم ڕاکە ڕاکـــەو پێچاوپێچـــەدا تەقارێم کەوتە پێـــش دووکانی ڕەجەبەشێتی دارتاش، ئەویش مشارەکەی بەدەستیەوە گرت و دەنگی دام، (نەڕۆی ســـەگباب، بۆخۆشـــی خۆت ( (هین)) دەکەی گوجیلەش لەبێشـــکەی مندا بەخێودەکەی، پارەش نادەی، پێتوایە من بەقەرزی بێنەو نییە لانکم بۆ توخمە سەگەکەت دورست کردووە، دەتۆ ڕاوەستە بۆم دەستم بتگاتێ، شەرت بێ ئابەم مشارە قاچت ببڕمەوە).

ئەز، لە ڕاکردن نەکەوتم لەوێ لۆوێ، لەم کۆڵان بۆ ئەو کولان، ناوە ناو سووکە ئاوڕێکم دەداوە، ئەوانیش هەردووکیان بەهەڕەشەو گورەشە و جوونـــدان تەقلەکووت بـــەدواوەم بوون، نەدەوێرام ســـەر بە کاوڵ بووەکەی خۆم دابکەمەوە، لەگەرمە گەرمەی ڕاکردندا خواو ڕاستان ڕێم کەوتە دەروازەی تەلاری ســـەرا، یەک شەق وەکو پاساری (باشووکە) ســـەرادووی نابێت تەنگی پێ هەڵچنی بێت، خۆم فجووڕی حەوشـــەی سەرا کرد، ئاوڕم داوە هێشـــتا هەربەدواوەم بوون، ئەمیان چەپەچاخ و ئەوەکەی دیکە مشـــاری لێم هەڵدەشەقاند، ناچار چاوم دا دەرگەی ژووری باش کاتب، پرســـی بەردەست و پۆلیسم نەکرد، خۆم گەیاندە

دەرگاو پاڵـــم بەدەرگە وەنـــا، دەرگاکەم بەتـــەواوی واری نەکردەوە، تەنها ســـەرم بـــردە ژووریّ، دیتم! جەنابی باش کاتـــب میوانی هەیە مژوولە، بە ئەسپایی دەرگاکەم پێوەداوە، نازانم چۆن بوو بەسەر زارم داهات گوتم ( ڕاوەســـتن کورە، ئارامتان بیّ باش کاتب نوێژ دەکات.) هەردووکیان لەجێوە چەقین و ڕەق ڕاوەستان، تاوێک دواتر میوانەکان هاتنە دەرەوە، ژنەک و پیاوێک بوون پێدەکەنین، ئەوانە پێشتر ناکۆک بوون، کابرا ســـوێندەکی خواردبوو دەســـتی بە دەستی ژنە نەکەویّ، دیاربوو باش کاتب دەســـتی ژنەی دابۆوە دەست پیاوەکە لە خۆشیان بوو پێدەکەنین.

باش کاتب بەســـەدای زەنگەوە بانگی پۆلیسی پێش دەرگەی کرد، کاکی پۆلیس چووە ژووریّ، دوای تاویّ هاتە دەرەوە پرسی.

ـ کیّ بوو گوتی باش کاتب نوێژ دەکات.؟!

ـ بەڵیّ من بووم.

فەرمـــووی لێکـــردم بۆ ژووریّ بـــاش کاتب، جەنابـــی باش کاتب گوتی،

ـ تۆ بووی گوتت باش کاتب نوێژ دەکات.؟!

ـ بەڵیّ قوربان من بووم، بچووکت.

ـ باشە، پێم بڵیّ بزانم کێشەوگرفتت چییە و لەگەڵ کێیە.؟!

ـــ بەڵیّ قوربان، بەنـــدە بابایەکی هەژارو نەدارم، کارو پیشـــەم قوڕکارییە، نەبوونی و دەســـت کورتی تەنگی پیّ هەڵچینوم، قەرداری قەســـاب و دارتاشـــم، هەردووکیان وا بەخۆو بە چەپەچاخ و مشارەوە لەپێـــش قاپی ڕاوەســـتاون بمکوژن، هەتا گەیمە ئێـــرە ڕۆحم لەبەردا نەمابوو، لەو ترســـەبوو سەرم لیّ شێوابوو، نازانم کووبوو بەسەر زارم داهات گوتم: باش کاتب نوێژ دەکات، قوربان نازانم چیبکەم؟!

نیمە قەرزەکانیان بدەمەوە، تاکو ئەمڕۆ کار بەمەگەیی بەمەبەستی کوشـــتنم هالێرە هالەویّ ڕاوە دوویان نام لـــە کۆڵم نەبوونەوە، ناچار

هانام بۆ ســـەرا/بۆ حزور جەنابت هێنا، کەچی کە ســـەرم بە ژووریَ داگـــرت، دیتم بەرێزتان مژوول بوون، دەرگاکەم پێوەداوە، پێم گوتن: ڕاوەستن کورە، باش کاتب نوێژ دەکات.

مـــن لە بەردەمی باش کاتب کزوومـــات و مەلوول ملم لار کرد بۆوە ڕاوەستا بووم، دیار بوو باش کاتب بەزەیی پێمدا هاتبۆوە، دواتر گوتی: ئێستا بانگیان دەکەم بێنە ژووریَ کارێکی وایان پێدەکەم ناوی خۆیان لەبیر بکەن، دەبێ مەمنوونی تۆبن لە قەرزەکانیشیان خۆش بن.

دواتر هەردووکیانی بانگ کردە ژووریَ، دوای ناو پرسین چ کارەن.؟! لێیان هەســـتاوە سەرپێ، خۆی لێ ڕاست و چەپ کردن، گوتی: پێتان وایە ئەم وڵاتە بێ حکومەت و بێ یاساو دادگاو قازی و دادوەرە.؟!

ئەگەر ڕاستەکەن ئەم پیاوە قەرزداری ئێوەیە، بۆچی؟! نەهاتن لە دادگا سکاڵای لەسەر تۆمار بکەن، پێم بڵێن بزانم ئێوەبە چ حەقێک ؟! بەمشـــار و سیکارد سەرتان لە دوای ئەم قوڕ بەسەرە ناوە، تەماشای کەن لەترســـان زارەترەک بووە، نتقی گیـــراوە، ڕەنگی ڕووی پەڕیوە ڕەنگی مردووی لێ نیشـــتووە، لەوانەیە زراوی ڕژابێ، کێ ناڵێ بەندی جگەری نەپساوە.؟! دەبێ بۆ لای پزیشک حەواڵە بکرێ، گوێ بگرن! هەرلەم ڕۆوە تاکو ســـێ ڕۆژی تر، ئەم بەلەنـــگازە داماوە بمرێ، یان دووچـــاری حاڵەتی دەروونی بێت، پێســـتەتان لەبـــەر دادەڕنم، وەکو ( (گاڕەش)) کەوڵتـــان دەکەمجەنابی پێداچـــوو گوتی: بێ غیرەتینە، ســـەگ غیرەتتان بخوات، خۆ هەر هیچ نەبێ ئەم مرۆیە برای دینییە، ئەگەرنا هاونیشـــتیمانییە، ئێـــوە ئەگەر بایی یـــەک زەڕڕە ویژدانتان هەبێت، بۆ کەمێک پارە ئەم هەژارەو لەقاف هەڵنەدەکێشا.

(من، لەگەڵ ئەم قســـانەی بەرێزیان بەزەییم بەحاڵی خۆم دەهات گریان لە قوڕگم دا قەتیس مابوو) ئیدی جەنابی باش کاتب شـــرت و شۆی شـــکاندن، ئاوەڕووتی کردن، هەردووکیان دەستەو دامێنی باش کاتب بوون، گوتیان:

( قوربـــان داوای لـــێ بـــوردن دەکەین، لەسەردەســـتی بەڕێزتان ئامادەین لەقەردەکانی خۆمان خۆشدەبین، نەهیچی ئێمە نەهیچی ئەو) باشکاتب، پێی گوتن:

هەتـــا ئەگەر بێت و ئەویش بەم شـــێوەیە ڕازی بێت، بەڵام دادگا بەپێی یاساو مافی گشتی، بەهۆی ئەم کردەوە نامرۆڤایەتیەتان هەرگیز لێتان خۆش نابێت، بەپێی ماددەی ژمارە (.)لەیاســـای نیشتیمانی بۆ ســـزادانی تاوانباران، بۆ ماوەیەکی دیاریکراو ســـزای زیندانی کردنتان بەسەردا دەسەپێنێ، یانیش لەجیاتی بەندکردن بەپارە سزاتان دەدات، دەبێ کاش بیژمێرن.

بانەبێتە هەزارشەوە، بێجگە لەلێخۆشـــبوون لەقەرزەکانیان، باش کاتب دایدۆشین، برەپارەیەکی قنجی لێ بەردانەوە، دواجار پێی گوتن: یاڵـــلا بڕۆن نەکەن جارێکی دیکە پێ لەتەختەی چرووک بنێن، ئەگینا گردەبـــڕ قاچتان دەبڕمەوە، تێگەیشـــتن.؟! یاڵـــلا لەخۆتان هەڵدەن دەرگاکراوەیە.

پشـــتی هنگـــی ئەم برەپـــارەو پوولـــەی کەلەخولەی قەســـاب و ڕەجەبەشێتی دارتاش وەری گرتبوو، وێیدام، ڤێجا لەتریقەی پێکەنینی داو پرسی،

ـ باش کاتب چ دەکات.؟!

ـ بەڵێ قوربان، باش کاتب نوێژدەکات.

ئەوجا بەزەردەخەنەوە دەســـتی بۆم درێژکرد، دەســـتم دادەستی، دەستی یەکدیمان گوشی، پاشان دوعابوونم لێ خواست، ڕۆیشتم.

-٤-

ئۆخەی، لەسـاى سـەرى باش كاتب، لەقەرزو شـەڕوبەلاّى خولەی قەسـاب و ڕەجەبەشـێتی دارتاش ڕزگارم بوو، وابوو بەهەناوی بەتاڵ و زگی برسی ئەوندەم ڕاكە ڕاكەو ئەم كۆڵان و ئەو كۆڵان كردبوو، ترس و تۆقینیش سەربار، لەبرسان لاكەم لێوەهات، جووت كەبابخانە خۆت بگرە واهاتم، گیرفانم گەرمە، یاڵڵا وەسـتا دەسـت گەرمبە و بۆم لێدە، چوار مەشـقی لێی دانیشـتم، بخۆ خۆ پێوەماندوو نەبوومە، ( (ماڵی نەخۆری بۆ چەكمە سـۆری تەقەتەق دەكات)) دواجار دووكەبابی ( لاتەرەف)یشم بەگەڵدا مەسـت بووم، چوارشیش كەبابی سەرپێیی شیان بۆم پێچایەوە بۆ ڕەحمەخانی هاوسـەرم، ئیدی هەستام بەمرومۆ بەناو بازاڕدا كەوتم، ئەوەی دڵم چوێ بەبێ سەوداو چەند و چوون، بیكێشە كاكە، دووكیسەم پڕكرد.

خـۆر بەناوچەوانی ئاسـمانەوە بوو، هەردوو دەسـتم گیرابوو، بۆیە گەییمە بەرامبەر دوكانی خولەی قەسـاب هەر بەسـەر سـلاوێكی قنجم

لێکرد، خوله بەرزەپێ لەبەرم هەســتاوە ســەرپێ، بەسەری لمووز پێم گوت:

-شوکر چاکی.؟!

- بەڵێ قوربان گەورەت کردین، سوپاس.

لەوێــوە بەئەنقەســت دامەوە پێش دوکانی ڕەجەبەشــێتی دارتاش، ئەویشم داخ کرد، دواتر دوکاندار بەدوکاندار ئەوانەی قەرزداریان بووم.

- ئەرێ زەحمەت نەبێ بزانە چەند قەرزدارم؟!

- بەڵێ بەسەرچاو، بۆم دەژمارد.

هەر کە پێم لەکۆســپەی دەرگای حەوشە ئاودیوکرد، بانگی هەیبەت خانــم کرد، کرێی دوومانگ قەردار بووین بــۆم ژمارد، فەرموو، ئەوەش کرێی مانگێک پێش وەخت، نەبادا دیســان لەترســی خاوەن قەرزوقۆڵە بەڕۆژ نەشــقیاو، تەنها شەوان وەکو شەمشــەمەکوێرە تاریک و تاریک، ئەگینا نەوێرم سەر دەرێنم،

: پێشینان فەرموویانە (( بەڕ،لەلای تەنکی دەدڕێ)).

بەڵێ، هەتــا ئەو(با)یەش لەمەیدانی کرێکاران بێــت، واتە هەتا ئەم خزم خزمانێ و کلکە ســۆتەیی و مەرایی و مێچکە مێچک و دەڵەچەیی و خزمی خەزووری ســەپانی شــێخی لەئارادابێ، هەزارانی وەکو خۆم ئاسا، دەبێ شــەوانە لەبەر قوڕەقــوڕی زگی خەو لەچاوی بــزڕێ، لێکدا لێکدا کەلەکــەی بگۆڕی، چونکە لەم شــارەی ئێمەدا پیــاوی ئەوها بەجەرگ و ئازاو دلێرو نەبەرد هەیە، گوێی شێربگری مێی دەکات، کەچی نانی شەوی نییــە بیخوات، پیاوی واش هەیە قەلەزراو ترســنۆک، یەک قەزناغ خوێی تێبکەی بەشــەو ناوێرێ تخونی ( گەڕەکــی جاولەبەران) بکەوێ، کەچی بالیفــی لەپارە دروســت کردووە، ژنەکەی بە هۆقە زێــڕ و زیو و مرواری بەخــۆی وەدەکات، خۆی پێ دەڕازێنتەوە، ڕســقی پیاوی مەرد کەوتۆتە دەســتی گۆردەو دەیوس و گەمبۆران، لەهەمــوو دەورو زەمانەندا گەمبۆر باوی بووە، هەتا دنیا دنیایە مسۆرگەرت بێ پیاوی پشت مل پان هەر لەباو دەبێت، بەئاشکرا لەسەر بەروبووم و بەرهەمی بەپێزی پێستە دەژی، ڕۆژی

یــەک ملێون جار پێی بڵێن: گەواد، تــەرەس، دەیوس، جاکێش ونەخێر، تەقەی ســەری دێ، گۆشــتی پێدەگرێ، کارخانەچییەتی یەک جۆرنییە، جۆرەها شێوەوشــێوازی مۆدێرنی هەیە، ئەم وەســتا چەکوچ بەگووانەش دەگرێتەوە، ئەوانەی لەپێنــاو پاروەکی تۆزێک چەور مێچکەمێچک لەبەر خاوەنکار دەکەن، لەدەمەدەمی تاوکەوتنەوە تاکو زەردەپەڕی خۆرئاوابوون دەیانڕەتێنــێ، ئەگەر کرێکارێک پێ گیری بــکات.؟! بێگومان بەیانی نان بڕای دەکات، بەتاقی تەنیا وەکو کەنگرە بێکەســە لەو گۆرە دەمینێتەوە نایبا بۆ ئیش.

بەڵێ ئەرباب، نانی مرۆی کەللەرەق لەنێوان عاردوعاسمان دا غەزریوە، کەچی بۆ مل حیزو کەللەپووکان لەســاماری دەباری، وابوو دیسان بەهۆی لاملی و کەللەڕەقییەوە دووچاری قەرزوقۆڵە بوومەوە، دەست بەتاڵ دۆش دامابووم، ڕۆژێکیان لەبەر ســێبەری دیواری مزگەوت هەڵقونچابووم، گوێم لەڕیش سپییەکی دنیادیتە بوو دەیگوت:

( گورگ ئەگەر لەبرسان بتۆپی، گۆشتی کوشتەی دەستی خۆی نەبێت دەم لەبەرماوە نادات.) یەکێکی دیکە بۆی سەلماند گوتی: ((ئەگەر کوڕ هەبێ تاریکە شەوزۆرە.)) بیرم لێکردەووە تاریکە شەو! واتا شەوی دزان، لەدڵی خۆمدا گوتم: ڕەحمەت لە مردووی ڕیش سپییان.

بێگومان دزو خاوەن ماڵ بەتەمای خودان، بەرەبەری بەیانییان لەخەو هەڵدەســتام، ناوی خودام لــێ دێنا، لەجیاتی ئەوەی بــڕۆم بۆ مەیدانی کرێکاران، چاوەڕوانی پەنجەی وەســتای چەکــووچ بەگووبکەم، دەچووم بەئەسپایی بەسەردیواری حەوشەی ماڵان دا هەڵدەگەڕام، تەشکە (لباد) با، شڕەجاجم بووا، کۆنەلێفەو بەڕەبایە، هەرچی دەستم کەوتبایە لوولم دەدا، دەمخستنە ناوگونیە، یان لەبن هەنگڵم دەنا، ئەگەر قورس بایە لەکۆڵەخۆم هەڵدەدا، تێم دەتەقاندبانەوەتان بۆ ڕوون بکەمەوە بۆچی لەکاتی بەرەبەری بەیانییــان دەچوومە ســەرماڵان بۆ دزی؟! یەکەم شــت حەس حەســی تۆبەداری شــەوان لەدەمەدەمی مەلابانگدان دڵنیــا دەبێت، وەختی ئەوە نەماوە درەنگە بۆ دز لەم کاتەدا بچێتە سەرماڵان، دووەم شت، پیاوانی ئەو

ســـەردەم فێری چێشتەخەو نەبوون، پێش مەلا بانگدان لە خەو رادەبوون دەرۆیشتن بۆ سەر ئیش وکار، ئەگەر چی بەرلەوەی لەماڵ دەرکەون بانگی هاوسەرەکانیان دەکرد لەخەوهەستن، بۆ ئەوەی دوابەدوای ئەوان دەرگای حەوشـــە لەلای ژوورەوە رەپێش بکەنەوە، بـــەڵام کەکەیبانووەکان لەخەو هەڵدەســـتان هەر بەچاوی خەواڵوو شمشێرەیان رەپێش دەکردەوە، خەو چاوی گرتبوون، بێگومان خەوی بەرەبەری بەیانیانیش زۆر قورس و خۆشە کە دەکەوتنەوە خەویّ ئاو بەناوماڵیان وەربێت، نەخێر بەئاگانایەن، منیش بەتەردەستی دەستی خۆم دەوەشاند.

دەســـکەوتی ئەم بەیانییە هەرچییەکی دەســـتم کەوتبایا، دەمبرد بۆ لای (جاجم فرۆش)، لەقەیسەری گەورە دوکانی کۆنە و نویّ و نیوداشی هەبوو، بەرلبادجاجمکەونە مافوورو کۆنە لێفسەرەنازو شتی دیکە دەکڕی و دەیفرۆشتەوە، جاری یەکەم و دووەم، جاجم فرۆش، پێی وابوو کەئەم پارچانە حەق ماڵی خۆمن، لەدەستکورتی دەیانفرۆشم، بەپارەیەکی باش دەیقرِســـاند، بەڵام کەکار لەکار ترازا، تێگەیی! ((کەر لەکویّ کەوتووەو کوندە لەکـــویّ دڕاوە.))مـــن، تازەکاربووم، کەچی جەنابی لەوســـەری گەڕابووەوە، ئەســـڵەن دانەخۆرەی کردم، تەڵەی بۆم دانابووەوە، وابوو ڕۆژێکیان جاجمێکی دوولای حەفت ڕەنگم دەســـت کەوتبوو، بردم بۆ لای دایی جاجم فرۆش، جاجمەکەی هەرگێڕو وەرگێڕ کرد گوتی:

ـ باشە لێت دەکرم، بەڵام دەستەبەرم لێت دەویّ.! پێم گوت:

ـ بۆچی کەفلیت لێم دەویّ.؟! گوتی:

ـ کورم، نەبادا سبەی ڕۆژی لەدوکانی من ئەم جاجمەی بەسەربکەنەوە، ئەوسا بێجگە لە زەرەروزیان و تێهەڵدان و حەپسخانە، لەم بازاڕەدا حەیاشم پێوە دەچێت و دەبیّ ئاشکراش بکەم ئەم جاجمەم لەکیّ کڕیوە.؟!

ـ بۆچی دایی، تۆ پێت وایە کەئەم جاجمە دزیارییە.؟!

پێکەنی، بەتەوسەوە گوتی:

نەخێـــر، لەوانەیە لەبەشـــە میراتـــی باوکتەوە بـــۆت ماوەتەوە، یان لەشەڕی (سات و قەڵا) وەگیرت هێناوە.؟!

نەخێر، لەئاست دایی جاجم فرۆش دەمم بووە تەڵەی تەقیو، بەداوێ وەبــووم، دواتــر دایی گوتی: ڕۆڵــە دڵ لە دڵ مــەدە، زۆرانی وەک تۆ خەریکی ئەم کارەن، پێداچوو گوتی.

کــوڕی باش، خانــەوادەو بنەماڵەی دۆمــەکان، کەداخوازیکەر دێت بــۆ خوازبێنی کچەکانیان، بەکچەکانیــان دا هەڵدەڵێن مەتحیان دەکەن دەڵێن: ماڵانگەڕەکون دۆزەرەنــان پەیداکەرنتۆ ئێوە مانانیش مادامەکێ نان پەیداکەرن، ناهێڵن خاوخێزانتان برســی و سەرگەردان بێت، نایەڵن چاویان لەدەســتی پیاوی نامەردو ناکەس بەچە بێت، ئەوەخۆی لەخۆیدا سەربەرزییە بۆ ئێوەمانان، لەدڵی خۆمدا گوتم: ئاشکرا بوو کێ دزە.؟!

ئیتر لەو ڕۆژە بــەدواوە لەگەڵ جاجم فرۆش لێکدی ئاشــکرابووین، شانمان لەشانی یەکدی گیرکرد، بۆئەو، کۆزوشەش بوو، هەرپارچەیەکی دەمهێنا بەنیوەقیمەت حیسابی دەکرد، کردەی من و بردەی جاجم فرۆش بوو.

جارێکیــان وەرزی هاوین بوو، خەڵک لەســەربانان و هیواش هەبوو لەحەوشــە دەخەوتن، تاریــک و ڕوونی بەیانی بوو خۆم هەڵدایە ســەر دیوارو ئاودیوە حەوشەیەک بووم، دیتم دووکەس لەناوەڕاستی حەوشەدا خەوتبوون، دنیا گەرم بوو، جاجمەکانیان بەقەدکراوەیی لەلای پێینگانیان دانابوو، تەماحگیربووم، پژدێنەکەم لەپشتم کردەوە، خەریک بووم لوولم دەدان تاکو بە پژدێنەکە بیانبەســتم بیانکەمە بارکۆڵە، تەقاپیرەژن لێم بەئاگاهات، لێی لــە هەللادام، کچەکەش وەخەبەرهــات، کارلەکارترازا، جاجمەکانم بەجێ هێشــت بۆی دەرچووم، خۆم هەڵدا بۆ ســەردیواری حەوشە، هێشتان بەتەواوی بەســەردیوار نەکەوتبووم، هەردووکیان تێم هالان، نیوەی جەســتەم لەسەردیواربوو، کەچی پاشەڵم لەدەستی ئەوان دابــوو، قونجیرکەی هۆتۆیان لەلا ڕان و ســمتم گیردەکرد، نینۆکیان لە گۆشتیدا ختم دەبوو، دواجار لەم ڕاکێش ڕاکێش و قونجیرکە لێدان و هەوڵ و تەقەڵلای من بۆ دەربازبوون تەقا دۆخینم پســا، شەڕواڵ کەوتە قاچ و گۆزینگم، دایک و کیژ توند گرتبوویان ڕایاندەکێشــا، منیش تەکانم دەدا

بەرخۆم ئاودیوبم، لەنکاو بەدیوی دەرەوەدا کەوتمە خوارەوە قورتاربووم، بەلام شـــەرواڵەکەم بووە قســـمەتی دایک و کیژ، بەڵنگی ڕووت مامەوە، باشبوو دەرپێی کورتم لەبەردابوو، کەچی خۆشبەختانە دنیا هێشتانەکێ ئەنگوٚرە بوو، شـــەقام وکۆلان تاکو تـــەرا ئەگینا چۆڵ بوو، بەپەنا دزەو بـــن دیوارو بن دیوار خۆم گەیاندەوە لای ڕەحمەخانی هاوســـەرم لەماڵ، ڕەحمەخان خەریک بوو بیکاتە فینگەفینگ و ڕوومەت و قژ ڕناندنەوە، پێم گوت: (وســـبە ئارامت بێ، مەیکە بەهەللا هیچ نییە ئافرەت کاری قەزاو قـــەدەرە)، بەهەرحاڵی هەبوو هێورم کـــردەوە، دواتربەپێکەنینەوەگوتم: کاری دزی ئەوهایە، خانەوادەی دز ڕۆژێک ســـینگ دەخوا، ڕۆژێک سینگ دەکوتـــی، دواتر پێکەنین گرتبووی بەری نەدەدا، تومەزە بەلاق و لەتەرو دەرپێی کورتی من پێدەکەنێ.

بۆ بەیانی ڕۆژی ئایندە، ئافرەتان دوو، دوو، ســـێ، ســـێ لەڕێگاوبان، لەبەر دەرگەو قاپی حەوشـــە، لەزارکی کۆلان ســـەریان نابووە بناگوێی یەکدی بەچپەو فسکەفسکیان بوو!!

ـــــ کچێ بابـــان کۆر، ئەم شـــەو دز چوویتە ســـەرماڵی عەتیەخانی بێوەژن.

ـ کچێ وســـبە ســـەربەهەش، ماڵی عەتیەخان چیان هەیە، تاکو دز بچێتە سەریان.؟!

ـ چووزانم خوشکێ، هەبێ و نەبێ ئەم ماستەبێ (موو) نییە، مەسەلەی کاکەو برالەیە،ئەگەرنا؟! ئەم دزە بەم بەرەبەری بەیانییە خۆشێت نەبووە بچێتە ســـەرمالان، قابیلە شەوقاتی بوو.؟! نەخێر، مانگ لەچواردە بێت، هیچ عەوجەبە ئەنگوست ناکات،

–ئێ ێئـــەم دزەدزی (هینە)، لەمێژە ڕاوکەی بـــۆ داندراوە، دانەخۆرە کراوە، ئەگەر وانییە کوو شەڕواڵی لێ بەجێ ماوە.؟! ئیدی پێدا دەچوون گوللەیان بەتاریکیەوە دەنا

: بەڵێ کاری دزی، ئەگەر چی کارێکی سەخت و ناهەموارو پڕ مەترسی و بەدڕەوشتییە، بەلام تام وچێژ و لەزەتی تایبەتی خۆی هەیە.

جارێکیان چوومە سەر ماڵێک ئەوەندەی گەڕام و سووڕام، چاوم گێڕا شتێکی وام بەرچاونەکەوت، تەنها (گیسک)ەکی دابەستەیان لەحەوشەی بەســـتابووەوە، لەدڵی خۆمدا گوتم: دوای ئەم هەموو ماندووبوون و ترس و لەرزودڵەڕاوکێیە، خۆ بەدەســـت وارایی ناگەڕێمەوە بۆ ماڵ، ئەســـڵەن عەیب و شـــوورەییە بـــۆ دز بەدەســـتی بەتاڵ بچێتەوە، چووم پشـــت پەســـتی دەرگای حەوشەم ترازاند، دواتر ئەو پەتەی لەملی گیسکەکەیان ئاڵاندبوو، ســـەرێکی پەتەکە بەســـکە زنجیرێکـــەوە گرێدرابوو، گرێکەم کردەوە، ســـەری پەتەکەم بەدەســـتمەوەگرت، تومەزە منداڵ گیســـکە دوڕەیان بەدەســـت گەمەدەســـتەمۆیان کردبوو، فێری گەمان و لچ ببوو، کەسەری پەتەکەم بەدەستمەوەگرت، بەدوای خۆمدا ڕامدەکێشا، لەدواوە خەریکـــی هەڵبەزودابەزبوو یاری دەکـــرد، ناوەناو خۆی هەڵدەدا هەردوو دەســـتی دەهاوێشـــتە سەرشـــانم دەیژەنی، زەینم دابووێ! ئەو نامەردە حەیتەکەی ڕەق کردبوو، ئەگەر خۆم بۆ شـــل کردبایە، ئەو بێناموســـە دەیقەوماند، دواتر باشـــبوو چیتر خۆی بۆ نەگیرا دەســـت پەڕێکی کرد، خاوبۆو لەهەڵپەکەوت.

بەڕێگاوە بیرم لێکردەوە هیچ مەعقوڵ نییە، لەم گۆشـــتە تەڕو تازەیە نەخۆم، بەم خەیاڵەوە بردم بۆ لای قەســـاب، بەم مەرجە پێم فرۆشـــت! بەچرپـــە بەگوێی قەســـابدا داچرپاند، پێم گوت: عەیـــب نەبێ ژنەکەم ئاووسە مەگیرانی بەجەرگ وناو دەکات، دەبێ جەرگ و ناوی گیسکەکەم وێبدەیتـــەوە، ئەگەرنا؟ بەتۆی نافرۆشـــم، قەســـاب ڕازی بوو گوتی: ( قەیدی چییە پێچک چوارە بەژمارە).

وابوو جەرگوناوی گیسکە دوڕەم بردەوە، بەبۆنەی جەرگ ناو چونکە دەگمەنە، هەیبەت خانیشـــمان داوەت کرد، ماوەیەکی خۆشم بەسەربرد لەگـــەڵ کاری دزی، ســـەیر ئەوە بوو کەپارە و پوولـــم نەدەما، دەچووم بۆ لای دایی جاجم فرۆش، پێشـــوەخت بەســـەر شـــتی دزیـــاری پارەم لێوەردەگرت، کەچی نازانم بۆچی؟! هۆکارچی بوو؟! ماوەیەک بوو هیرم نەبوو، هەلم بۆ نەدەڕەخسا، بەختم نووستبوو، لەکارکەوتبوو، هەرچەندی

هەوڵم دەدا لەکەلێنەک خۆم تێبکەم دەستی خۆم بوەشێنم نەبوو، تاکو سبیانەکێ دوای نوێژی بەیانی لەمزگەوت هەشتنۆدە بەرماڵە نوێژم لوول، بەتەڕدەستی خستمە ناو گونییە بەشانی خۆم دادا ڕۆیشتم، دایی، خۆت بگرە وابەرماڵەنوێژم هێناو هاتم.

نازانم چ حەرامزادەیەک، کامە کوڕی باش، کوڕی کام فیشەک دز پێ حەسیابوو، پۆلیسی لێم ئاگادارکرد بۆوە بەگرتنی دام، دووشەو لەبنکەی پۆلیس بەدەست بەسەری مامەوە، بۆ بەیانی ڕۆژی دواتر پەلکێشیان کردم بۆ بەردەم دادوەر لەدادگا.

لەم وڵاتەی ئێمە لەسەر گەندەڵی و دزینی شتی زۆرو گەورەو نەقوڵا، لێکۆڵینەوەو لێپرسینەوە لەگەڵ کەس ناکەن، بەڵام لەپای دزینی شتی کەم و بچووک و بێ قیمەت کەوڵت دەکەن، پێستەت ڕوانەی دەباغ خانە دەکەن، بۆیە ئامۆژگاریتان دەکەم! ئەگەر هاتو ڕۆژی لەڕۆژان بیرتان لەکاری دزی کردەوە، بیرۆکەی دزی کەوت کەللەتان، قەت خۆتان لەقەرەی دزینی شتی بچووک مەدەن، ئابڕووتان پێوەدەچی خوتان، لەقەرەی شتی قەبەوزل و قەڵەو بدەن، بێگومان لە ژیاندا بەختەوەرو خودان شوهرەت و سەرفرازو سەرکەتوو دەبن.

جەنابی دادوەر، دوای وەرگرتنی زانیاری تایبەت بەکەسێتی جەنابم، گەرەکی بوو بەزمانی هەڕوجیڤ و چاوو ڕاو لەخشتەم بەرێ، بەڕێزیان پێیوابوو کە ئەز قەڵلاجم، بەسادەو ساویلکەیی خۆم دەرکی هەنبانەی بۆ واری دەکەمەوە، هەر چ دزییەکی کردوومە، بەسوک و ساناهی لەپێش دەمی هەڵیدەڕێژم، بەڵام من پێگیریم کرد، پێمگوت:جەنابی حاکم ڕاستە من دزم، بەهۆی کاری دزییەوە دەستگیرکراوم، دەشێ لەسەر دزینی ئەم بەرماڵە نوێژانە دادگاییم بکەن، بەڵام کوا داواکار، شکاتکەر؟! ئەگەر کەسێک سکاڵای لەسەرم تۆمارکردووە؟! بابفەرمووێ، ئیسپاتی بکات کە ئەم بەرماڵە نوێژانە حەق ماڵی ئەون، ئەو وەختە ملم لەمووەک باریکترە لەهەمبەر یاسا.

حاکم گوتی: ئێمە، حکومەت لە جیاتی شکاتکەری نادیار، چونکە

مزگەوت جگە لەوەی شـــوێنێکی پیرۆزو ماڵی خودایە، موڵکی گشتیشە، کەواتە ئێمە وەکو حکومەت و پۆلیس خۆی بەرپرســـیارە لەپاراســـتنی کەلوپەلی مزگەوت.

ببوورە گەورەم، ئەوەی من بزانم هیچ کەلوپەلێکی مزگەوت لەتۆمارگەی حکومـــەت تۆمارنەکراوە، کەواتە هیچ تۆمارگەیەک لەبەردەســـت دانییە، وابێ بیســـەلمێنێ ئیســـپاتی بکات، هەنگێ بەپێی یاســـا مافی دەوڵەتە لەدادگا سکاڵا لەسەر کابرای دز تۆمار بکات.

دیاربوو جەنابـــی حاکم ڕووی گرژبوو، زۆر تورەبوو لێم، گوتی: هەی بێ غیرەت، ســـەگ غیرەتت بخوات، چوویتە ماڵی خودا لەمزگەوت باری کەرێک بەرماڵە نوێژت دزیوەو دان بەدزیەکەشـــت دادەنێیت و ئەم زمان ڕەپیەت لەچی.؟! بەڵێ قوربان لەڕاستیدا ئەم بەرماڵە نوێژانە حەق ماڵی خودان، موســـڵمانان بەخێری مردووەکانیان بەماڵی خودایان بەخشیوە، کەچی نازانم ئێوە کەســـەرتان نایەشـــی بۆچی پـــەڕۆی تێدەئاڵێنن؟! بێگومان خودای پەروەردگار موقتەدیرە، لەڕۆژی هەســـتانەوەو حیسابدا لێپێچینەوەم لەگەڵ دا دەکات.

دیاربوو جەنابی حاکم و هاوکارانی سەر بەدادگا لەبن لێوان دەگرژینەوە پێکەنین گرتبوونی، ئەم جارەیان دادوەر پرسی:

ـ هەڵبەتە بەتەمابووی بیانفرۆشی، یان؟!

ـــ بەڵێ قوربان، بەتەمابووم بەرماڵە نوێژەک بۆ خۆم و ڕەحمەخانی هاوســـەرم گلبدەمەوە، بەخێری خاوەنی نوێژی لەسەر بکەین، بەنیازیش بووم بەرماڵێکیان بدەم بە (مەلا کۆرەی شەش پەنجە) لەوانەیە جەنابتان بیناســـن، مەشـــهورە ســـێ ژنی هەیە، بەمەرجێک؟! لەمانگی ڕەمەزانی ئاینـــدەدا بۆ گیانی ڕەحمەتی دایکم، خەتمی قورئانی بۆ بکات، هەروەها بەتەمابووم دوو بەرماڵێش بەجیا بفرۆشم، لەڕۆژی هەینی دا پارەکە ببەم بچم لەبەر قاپی مزگەوت، دوابـــەدوای نوێژی بەکۆمەڵ بەخێری خاوەنی بەرماڵەکان پارەو پوولەکە بەسەر هەژارو بێ دەرەتاناندا ببیەشمەوەجەنابی نەیهێشت قسەکەم تەواو بکەم پرسی: ئێ، چیتربڵێ بزانم.؟!

ـ بەڵێ، بەتەمابووم بەرماڵە نوێژەکانی دیکەش یەکجێ بیانفرۆشـــم، بەنیازبووم بەگوێـــرەی پارەکە بۆمانگی ڕەمەزان هەندێک دانەوێڵەی پێ دابین بکەم، بۆخەرجی جەژنەش خودا ڕازقی ڕزقە.

دوای ڕێســـتنی ئەم قسانە،جەنابی چیتر خۆی پێ نەگیرا، لەحریتەی پێکەنینێ دا، ئەوانەی لەژووری دادوەردابوون، تێکرا لەقاقای پێکەنینیاندا، کەچی من هەگیز خۆم لەگوورە نەبرد، ئەســـلەن نەشـــگرژیمەوە، چۆن پێدەکەنم؟! دواجار حاکم بڕیاری دادگای خوێندەوە، تیایدا هاتبوو!!

ـــــ یەک: بەبڕیـــاری دادگا، لەم دەبەرماڵە نوێـــژە، دووبەرماڵ بدرێ بەکەسی دز،یەکێکیان بۆخۆیان، ئەوەکەی دیکەیان بۆ مەلاکۆرەی شەش پەنجە، لەبڕی خەتمی قورئان بۆ ڕۆحی ڕەحمەتی دایکی دز،

ـــــ دووەم: بەبڕیـــاری دادگا،کەســـی دز ئازادبکرێ، بـــەو مەرجەی بەڵێننامەو پەنجە مۆری وەربگیرێت و واژۆی بکات، کەجارێکی تر تخوونی ماڵی خودا نەکەوێ،

: ئۆخ خەیسەت ئۆخەی، بەڕووسپیاتی ڕزگارم بوو، بەلاّم تۆبلێیی:کێ، بەڵێننامەی و پەنجەمۆر بەفلسێکی قەڵپ دەکرێ؟! ئیدی لەدێر زەمانەوە گوتوویانە! ((تۆبەی گورگ مەرگە))

یان لەکوردەواری دادەڵێن ((قونێ فێری تربێ، هەردەترێ))

بەڵێ پیشـــەی دزی، تام وچێژو لەزەت بەخشـــە، تێکەڵ بەهەست و نەســـت وهۆش وشادەماری خوێن دەبێت، هەروەکو کابرای کوهولی، زۆر زەحمەتە مرۆ بشێ وابەئاسانی دەســـتبەرداری بێت، ئاخرمنیش لەسەر پیشـــەی دزی لێ ڕاهاتووم، وەکو نیکۆتین تێکەلاّوی خوێنم ببوو، هێدی هێدی لەگەڵی دەهەژامەوە، لەڕاســـتیدا ویژدانم ئاسوودەبوو،چونکە کەم خۆری دایـــم خۆربووم، هەرگیز چـــاوم لەخۆدەوڵەمەندکردن نەبوو،قەت بیـــرم لەوەنەکردووتەوە ڕۆژێ لە ڕۆژان ببمە دەوڵەمەندێکی بەناوو دەنگ بێگومان بیســـتوتانە دەڵێـــن ((دەوڵەمەند خەریکـــی جۆخینە، هەژار خەریکی دۆخینە)) بێ چاوو ڕویی نەبێ، بەندە، تەنهالەخەمی زگ وبەرزگم دابووم، ((هینی ئەمڕۆبەقینگی سبەینێ)) دروشمی ژیانی منە،

دواجار ســـبەینەکی زوو، وەرزی سەرماوســـۆڵەو تەڕو تووشی بوو، بەڕۆژەوە ماڵێکم دەستنیشان کردبوو، وابوو لەکاتی هەڵگەڕان بەسەردیواری حەوشـــەدا، پێم هەڵزەلی بەربوومەوە سەرعاردی، گردەبڕهێسکی لوولاقم شکا، پەکم کەوت، دوای گرتنەوەش دەلەنگیم، لەپای ئەم لەنگییەوەبوو دەستەواژەی (شەل) واتە ئەحەشەل، بوو بەپاشگرو نازناوم، ئیتر بەلنگی شـــەلەوە چیتر کەلکی خۆهەڵدانە ســـەردیوارو بـــاز بازۆکێم نەما، چیتر نەدەچووم بۆ ســـەرمالان، بەم قاچ شـــکانەم، ((لەقەل بووم لەکۆتریش بووم))من، لەوەپێش بەلاقی ساخ کە دەچوومە مەیدانی کرێکاران، وەستای دڵ ڕەش و ژەنگاوی، لەهەفتەی ڕۆژێک نەیاندەبردم بۆئیشـــکردن، ئیستا بەلنگی شەل، کێ پێم دەڵێ مەرحەبا.؟!

بەڵێ، ئەم هەموو دەردەســـەریی و کاروپیشەی دزی و قاچ شکانەم، هەمـــوو لەئەنجامی دڵڕەشـــی و بێ زەیـــی و مخەنەتی مرۆڤ و خزم و خزمانی و خۆخۆییەوەیە هەڵیدەگرمەوە، هەرچەندی دەکەم و دەکۆشـــم نـــان و دۆم یەکدی گرنابێـــت، مرۆ، ئەگەر شـــەلەبێ کوێرەبێ گۆجەبێ مجرۆبێ ژیان ئەوە نازانێ، دەبێ بەردەوام بۆ پەیداکردنی نان تێبکۆشێ، بـــەڵام چ جۆرەنانێـــک؟! نانێک بەزەبری هێزی بـــازوو، بەجەربەزەیی و چاوقایمی خۆت بیخەیتە سەرسفرەی خوان، نەک نانی مێچکە مێچکەیی و کلکە سۆتەیی و ماستاو چییەتی و چاو بەرەژێری، وەکو کابرای عەدەد مەســـینەی دیوەخان، بۆیە مکوڕبووم بەشێوازێکی دیکە لەسەر پیشەی خۆم، پیشەی دزی بەردەوام بم.

وابوو ڕۆژێکیان بەشەلەشەل بەرەرو بازاڕ دابوومە بەرحینگان، لەبازاڕی وردەواڵە فرۆشان هەندێک مۆرووم کڕی، پاشان لەبازاڕی تەزبێح فرۆشان پێنج مەتر داوی نایلۆنم کڕی.

: پێشتر بیســـتبووم قەرەجەکان بەم فرت و فێڵەی ئێستاکێ بۆتان باس دەکەم، چۆن؟! مامرو کەڵەشێریان قیرەبڕ دەکرد دەیان دزین.

منیش بەهەمان شـــێوەو دســـتووری قەرەجەکان، قلە مۆرووەک و قلەنۆکەکم بەســـەرێکی داوەکە وەدەکرد، دەچووم لەشوێنانەی مریشک

و کەلەشـــێر بەدوای دانەوێڵـــەدا دەگەڕێن چینەی لێدەکەن، ســـەرێکی داوەکەم بەدەســـتمەوە دەگرت، سەرەکەی دیکە کەمۆرووودانی پێوەبوو، بەهێواشی بۆم تێهەڵدەدان، بەتاو بۆی دەهاتن تێ ڕوودەبوون بەدندووک دەیانقۆزتەوە، پەلەیان دەکرد زوو ئاودیوی بکەن، کەچی لەناو قورگیاندا گیردەبوو، بۆیـــان قووت نەدەدرا، جاهێدی هێدی بەئاســـپایی داوەکەم ڕادەکێشـــا، هەندێ جار زۆربەئاســـانی قیرەبرم دەکردن، جاری واشبوو فریای نەدەکەوتم دەخنـــکان مرداردەبوونەوە، جارجارە بەرەڵلادەبوون، ڕەنجەڕۆدەبـــووم، ئەم ڕێگەوێ شـــێوازە ناهەموارو ســـەخت و نالەباربوو، زۆرئازاری پێدەگەیاندن، ویژانم ئاســـوودەنەبوو، بۆیە بیرم لەڕێگەیەکی دیکە کردەوە، بەڵکو ئازاریان پێ نەگات، ویژدانم ئاسوودە بێت.

ڕۆژێکیان لام دایە دوکانی (یاقـــۆی عارەق فرۆش) چارەگێک عارەقم کڕی، لەماڵەوە هەندێک گەنمی بن بێژینگمان هەبوو، هەردوو ڕۆژ، ســـێ ڕۆژجارێک دەســـتبەکاردەبووم، پێکێک عارەقم دەکردە ناو قاپێکی پەل، کەمێک ئاوم بەســـەردا دەکرد، چنگێک گەنمم لەچاوی دەکرد، پاشـــان دەمبرد لەنزیک گوفەک و شـــوێنی زبڵ و زاڵ، یان لەدەم جۆگەوچڵپاوی ماڵان، لەشـــوێنەکی لاچەپ دام دەنا، ئیدی مریشـــک بەباڵەفرەو ڕاکردن بۆی دەهاتن دەکەوتنەســـەری تۆیان لێدەبـــڕی، دواتر یەک لەدوای یەک گێژو ویژدەبوون، لەپەلوپۆ دەکەوتن لەجێوە پەلەواژ دەبوونەوە، پشـــتی هنگێ دوو، دوو، سێ سێ جەلەم دەکردن، بەشەلەشەل هەیپام لێدەکرد بۆ بازاڕی مریشـــک فرۆشان (مامۆ)ی مریشـــک فرۆش خۆت بگرە ڕزقەو بۆت هات.

:مامۆی مریشـــک فـــرۆش، هاوچەشـــنی دایی جاجم فـــرۆش بوو، هەردووکیـــان هێندە کارامەو جاقی و ڕاهاتووبوون لەســـەر کارەکانیان، حوشـــترت بەبارەوە دزی بایە، ڕادەستی ئەوانت کردبایە، بێ خەم بای، بەدەست گەرمی بەدەردی ئاردی ناو دڕکانیان دەبرد.

لـــەم تێکە و لێکەیەدا بەشـــی من تەنها بخۆو بـــڕۆ بوون ئەگەر چی خێـــرو بێرەکەی دەچووەگیرفانی جاجم فرۆش و مریشـــک فرۆش، بەڵام

هەرگیز بەلامەوە گرنگ نەبوو، چونکـــە چاوەڕوانی پەنجەیناموبارەکی وەســـتانەبووم منەتم لەســـەر بکات، واتە پیاوی کەســـێک نیم دەســـت لەسەر ســـینگ بەرفەرمانی بم، سەربەســـتم، هەموو ڕۆژی دوای نوێژی (ناوەند)عەسر، بەئارەزووی خۆم تیلاکم لێ خواردەکرد، یان جەمەدانیم دەنایەبن هەنگڵم، کڵاوم بەلاری دەهێنا سەر ئەبرۆم، بەڕێوەجگەرەیەکی (ئەبوبەزون)م، بەلالێومەوە دەگرت، یاغر یاغر دەچووم لەقاوەخانەی عەبۆ قاوەچی، لەڕیزی پیاو ماقوڵان لەپێشـــەوە لەســـەر تەختێک دادەنیشتم، لنگم تێک دەپەڕاند (شا)م بەسەپان ڕانە دەگرت.

-٥-

بەڵێ کاکەبرا، مرۆ لەژیانیدا هەرگیز نابێ و ناکرێ چاوی لەدەستی دەوڵەمەندی پیســـکەو لەچەرو دۆ نەدیتەبێت، دەبێ شاقەڵ و لەچکی کەوای بنێتە بەرنیفۆو پڕدێنی، دەلینگی شـــەرواڵی هەتا ئەستووڕایی ڕانی هەڵبکات، قورپشـــێلان بوو، گێرەی قورەبرنج بوو قورەپەســـتی سەرخانووبوو، قەت لێی نەپەنگێتەوە، ملی لێ بنێ گرنگ نییە، گرنگ ئەوەیە!مرۆ لەژیانیدا دەســـت وەکەری بکات، بتوانێ لەهەموو ئاشەک باراشی خۆی لێبکات، واتە ژیان بێ گۆڕانکاری هیچ چێژوتامی خۆشی نادات، بۆیە واچاکە قەت نێڵی لەهەوارێک کووچە ئاگردانت ڕەش بێت، خۆتۆ لەو(مار)ەکەمترو بێ هۆشترنیت، ساڵی جارێک خۆی دەگۆڕێ، کراسەکۆنەکەی فڕەدەدات، کراسێکی تازەونوێ دەپۆشێ.

ئەزیش کە کەرســـتەی ڕاووشـــکارم هەڵدەگرم، بریتییە لەدەفرێک و هەندێـــک دانەوێڵە، لەگەڵ بتڵێک ئـــاوو چارەگێک عارەق، ئەوانەی

کەرستەی ڕاووشکارو بژێوی من بوون، وەلێ لێتان ناشارمەوە، دەمێکە لەگەڵ ئەو کەرســـتانە لێکدی بێزاربووینە، ڕەزایان لەپێش چاوم گران و دزێوبوو، هەوەســـم بەچەهرەیان نایەت، کەهەڵیاندەگرم ســـەرتاپا هەمۆوگیانم دەبێتە (لیر) پێ حەسپابووم لێک دیمان هاوێتبووە ملان، ئەسڵەن (شـــیر)مان لێکدی دەســـاوی، نەخێر، ژنەوتـــم تازەپێکەوە هەڵناکەیـــن، لەپێش چـــاوی یەکتر تەواو ڕەش بووینـــە واچاکە هەتا کارلەکارنەترازاوە، (بەرد بەلایەک باگـــوردان بەلایەک)بالێرە بەدواوە کەلەشـــێر و مریشکەکان بەهەوەس و ئارەزووی خۆیان، بەئاسوودەیی چینە لەخۆڵەپـــۆک و زبڵ و زاڵ بکەن، جگە لەوەش حەزناکەم چیتر چـــاوم بەچەهرەی مامۆی مریشـــک فـــرۆش بکەوێتـــەوە، مامۆی مل کۆپەران، دەڵێی بەکۆتکی شوانکاران ئاوودۆی خواردووتەوە.

شـــەوا بووری لەخەونم دابوو! پێموابوو مردبووم، بەڕووتی لەسەر تاتەشـــۆری مزگەوت درێژیـــان کردبووم، لەم خەونەمدا کەڵەشـــێر و مریشکەکان هێشتان ســـەرخۆش بوون، بەری نەدابوون بەخۆبێنەوە، بەچواردەورمدا بازنەیان بەســـتابوو، گەمارۆیان دابووم، پەیتاپەیتا لێم دەهاتنە پێش، بازنەکەیان تەسکتردەبووەوە، گەرەکیان بوو بەدندووک چـــاوم هەڵکۆڵـــن، کەڵەبابـــە جنجرەکەیان لێم بەزمـــان هات گوتی: (نامـــەرد، تۆنانی مردووان دەخۆی، کەچـــی تیلاکت لێ خواردەکەی پێتوایە کەنانی دەست و بازووی خۆتە زەقنەبووتی دەکەی.؟!)

: وەکو شـــێت لەخەو ڕاچڵەکیم، هەرلەجێوە نیو ڕاست بوومەوە، چاوم هەڵپشافت، تەماشای ئەولاوئەملای خۆم کرد، هیچ لەئارادانەبوو، بەڵام لەشەرمان ئارەقەی ڕەش و شینم دەردابوو، لەترسان تۆقیبووم، هەناوەکوتەم گرتبوو، هەر لەبەرخۆمەوە بڵماندم! پەککو چ خەونێکی ناخـــۆش بوو، ئەم خەونەوای لێکردم بەیەکجاری دەســـتبەرداری دزی بـــم، ئیترما بیربکەمەوە، تێفکریم، پیشـــەیەکی دیکە بگرمە دەســـت بەمەرجێک؟! بۆنی نێرانەی لێ بێت.

-٦-

ڕۆژێکیـــان بەناو بازاڕدا دەگەڕام و دەســـوڕام، بەدوای شـــتێکدا دەگەڕام خۆشـــم نەمدەزانی ئەم شـــتە چییە؟! لەنـــکاو لەدووکانێکی تایبەت بەفرۆشـــتنی کەلوپەلی یـــاری و دەمانچۆکەی منداڵان، دیدەم چەقییە سەر دەمانچەیەکی پلاستیکی، لەشێوەو قەبارە کتومت چواردە خۆربوو، زۆر ســـەرنج ڕاکێش بوو، دەستم گەیاندێ هەڵگێڕو وەرگێڕم کرد، فیشـــەکی پلاســـتیکی دەخوارد، کەوتە بەردڵم کڕیم، دەمانچەم خستە بەرپژدێنم ڕۆیشتم.

: لـــەو ڕۆژەوە بوومە خاوەنـــی دەمانچە، دەبێ بژێـــوی ڕۆژانەی خاوخێزان و مانگانەی کرێی خانوو بەلوولەی ئەم دەمانچەیە پەیدابکەم، وەلێ لەدڵی خۆمدا گووتم:

لەوانەیە بەهـــۆی ئەم دەمانچەیـــەوە، وەکو (حەمەدکۆ)ئاســـای بەناودەنگ و شـــوهرەتی خۆم بکەوم، هەنگین لەنێوکۆمەڵدا بێگومان

شوێنم دیار دەبێت، تەشریف بۆهەرکۆچک و دیوەخانی ئاغاو سەرەک عەشـــیرەت و بەگلەرو گەورە پیاوانی دەوڵەت ببەم، بێشک بەفەرموو، فەرموو کەرەمکە بۆهەوراز هەڵکشێ، زۆر بەڕێزەوە پێشوازیم لێدەکەن. ئەی چۆن؟! حســـابی پیاوە ماقووڵ و نەجیب زادەم بۆ دەکەن، بگرە لەڕۆژانی پرسەو سەرەخۆشیشدا لەمزگەوتەکان دا، بڕواتان بێ لەخۆم تەریق دەبمەوە!! هەربەهەمان شـــێوە، ((فەرموو فەرموو هەڵکشێ بۆ هەوراز))

:ئێ، ئەم خەڵکە چاوبەســـتراوەیە هەرئەوەندەی لێ دەوەشێتەوە، گای بەگونان دەناسن، ئەگینا کەر، هەرکەری جاران و دوێنێ و پێرێییە، تەنها کورتانی گۆڕاوە، بێگومان لەوانەشە!! ڕۆژێ لەڕۆژان هەر بەهۆی ئەم دەمانچە نەفرەتیەوە، دووچاری کێشـــەو گرفت و گۆبەندو تووشی کونەڕەشـــەو دوژمنداری بم، لەدەمەوســـاتێکی وادا گرفتاری بەڵایەکی ناگەهـــان بم، هەتامن نەڵێم ((شـــێر نیمە ڕێـــوی مە))کەوڵم دەکەن پێستەم دەچێتە دەباغخانە، دەی، دەی گوێی مەدەرێ، قەت نابێ مرۆ هێندە ترســـنۆک و قەلەزراوبێ، بەقەرد بترسێ، ئەگەر بدەر لەوانەکی گەورە بترسێ، نابێ هین بدات،

: لێـــرەوە ڕێڕەوی کارم گۆڕی، لەدووتایم دەســـت بە کاردەبووم، ئەگەرنۆبەتـــە کارکردنـــی درەنگی هێوارانم بایـــە، دەمانچەی گۆرینم دەخســـتەبەر باخەڵم، لەدرەنگانی شـــەودا یاغر یاغر دەچووم تاقیبی سەرخۆشـــەکانم دەکرد، ئەودەمەی بـــەلارەلار لەمەیخانەوە بەرەو ماڵ دەبوونەوە، لەسوچێک لەهێکەوە دەمانچەم لەسەر ڕێسەی ملی دادەنا، نەجووڵێی سەگباب، لەترســـان نتقی دەگیرا، بەتەڕدەستی دەستێکم بەگیرفـــان و باغەڵی دادێنا، ماقرم پێ نەدەهێشـــت، پشـــتی هنگێ دوو، ســـێ شـــولاقم دەخێواندە لاقوونی، برۆ سەگباب ئاوڕ نەدەیتەوە ها، هەروەتۆ، جێ دانیشـــتنی عارەق خۆرەکانـــم پێدەزانی، دەچوون لەدەروبـــەری قەســـابخانەو بن دیواری شـــوورەی قەبرســـتانی چراغ

دادەنیشـــتن، تەرتیباتیان ڕیز دەکرد، بەدەم گۆرانی و قۆریات گۆتن، هێدی هێدی پێکیان هەڵدەدا، لەهیکڕا بەدەمانچەی گۆرین دەنیشـــتمە ســـەریان دەنگم دەدان! یالڵا ڕووت بن ســـەگبابینە، ئەگەرنا؟! داتان دەبێژم، دەی دەست و بردکەن، زووکەن خۆتان بخورێنن، نەکەنزمانتان نەگەڕێ، ســـەلیقەی چەندو چوونم نییە، درەنگم بەســـەردادێت، دەی پێویست بەخۆگنخاندن ناکات، هەرچی پارەو پوولی وێتانە بۆم بنێرن، هەتا ئاگرم لەسەر پشتتان نەکردووەتەوە، بێگومان بەناچاری گوێڕایەڵم دەبوون،

: بەڵێ، ئەوە یاســـاو ڕێســـای زەبرو زەنگی چەکە، دەبێ زۆریش مەمنوونم بن، چونکی وەبەر شـــەق و پێلەقەم نەداون، هەربڵێن: لەل! تێرشەق و شولاقیان دەکەم،

وەلێ ئەگەر نۆبەتەکارکردنی دەمەوساتی مەلابانگدان بووایە، تاریک و ڕوونی بەیانی دەچووم لەســـەرە کۆڵانـــان و دەروازەی گەرماوەکان، لەپەناگەیەکی تاریک خۆم دادەنووساند، چوونکی دانیشتووانی شار لە شـــەوانی هەینیدا بۆکافر کوشـــتن دەچنە غەزا، بۆیە سبەینانی ڕۆژی هەینـــی پێش مەلابانگدان، بوخچەی کەل و پەلو پۆشـــاک دەنێنە بن هەنگڵیان، بەتای کراس و دەرپێی سپی یان کراس و بێجامەی خەتخەت قەستی گەرماو دەکەن،

: جاوەکو مێردەزمە لەهێکەوە دەمانچەم لێ ســـواردەکرد، پێشـــم لێدەگرتـــەوە، لولەی دەمانچـــەم دادەنا ســـەرتەختەی نیوچەوانی، دەمگـــوت: خۆبکرەوە ســـەباب، لەجێوە دەحەپەســـا، دەمی دەبووە تەڵەی تەقیو، چاوی ســـپی دەبوو، دەســـتی بەخۆیدا شۆڕدەکردەوە، دەســـتێکم بەگیرفان و باخەڵی دادەهێنا، ئەگەر پارەو پوولی بەکەمی هەڵگرتبایـــە؟! بوخچەکـــەم لێوەردەگرت دەمکۆڵییەوە، جاســـەعاتی دەستی بووا، هی بەرباخەڵی بووایە، هەرنا کورتەک و شەڕواڵ و پژدێن وکڵاو و هەوری و جەمەدانی هەمووم گلدەداوە، پاشان دوو شاپی تەڕم

تێدە ســـرەواند، یاڵڵا برۆ سەباب، لەخۆت هەڵدە، دەی، وام لێدەکرد تام و چێژو لەزەتی غەزاو کافرکوشتنی لەبیربچێتەوە.

ئەوجـــا دەمەدەمی چێشـــتەنگاو، بەخۆم وکورتەک و شـــەرواڵ و هەتیـــو هوت، دەســـتکەوتی زەحمەتی ماندوو بوون و شـــەونخونیم، نەرمە نەرمە، بەشلەشـــەل دەمدایە بەرحینگان بـــڕۆ، (قاری بازار) خۆت بگـــرە واهاتمهەنگین (.) دۆمی ڕەحمەتی دەلاڵ باشـــی بازاڕی پیرەژنان (قاری بـــازاڕ) بوو، ئەگەرچی کابرایەکی مەی خۆرەوە بوو، لەچاو مریشـــک فرۆش وجاجم فرۆش بەسەد ئاو شۆرابۆوە، ئەگەرچی مرۆیەکی هەژارو دەســـتکورت و نەداربوو، بـــەڵام مرۆیەکی چاو تێرو دڵفرەوان و بەویژدان بوو، هەرگیز چاوی لەبەر نەدەنا، لەپای کارەکەی دەنگی دەکەوت، قورگی هیشک دەبوو هێندەی هاواربکات، کەچی حەق دەســـتی ماندوبوونی پارەی یەک پاکەتە جگەرەی غازی و چارەگێک عارەق پتری نەدەگێڕاوە،

کـــەل و پەلەکانم ڕادەســـتی بەرێزیان دەکرد، ئـــەم نورانییە وەک پیشـــەی هەمیشەیی بەپوختەیی و نایابی کەل وپەلەکاندا هەڵدەگوت، دواتر دەیدایە مەزات!

(ئەم کورتەک و شـــەرواڵ و مشکییە ڕەشبەڵەکە مەزات، قوماشی فەتاح پاشـــایە زۆر نایابە، جەرەبی نییە، بەخسووسی بەڕادان دراوە، دەی، کێ بوو خۆی پۆشتە بکاتەوە، بابکۆخێ، وەرە لەدەستە خۆتی مەدە، هەرزانە پەشیمان دەبییەوە، وەرە بۆی، ئەوە فاسوونە، عەمارە ســـۆت نییە، وەرە پێش بکۆخە، کەس نییە ها؟! هەڕاج یەک، هەڕاج دووکەس نییە، هەراج ســـێ، هابگرە شایەل خێر، پیرۆزە، کورتەک و شەرواڵەکی پیاوانەیە، هەرلەخۆت دێ)

-٧-

بەڵێ ئەز خولّام، لەژیاندا بەدەیان و بەســـەدان شێوازو ڕێگا هەیە بۆ پەیداکردنی نان، وەک نانی کلکە سوتەیی/نانی پاکاری/نانی سینە سپەرکردن/نانی مێچکەمێچکەیی/نانی دەرگەوانی/نانی چاو بەرەژێری/ نانی ماستاوچیەتی/نانی عەددەمە سینە/نانی گەوادی/نانی گۆردەیی/ نانی گۆشـــتی خاو/نانی دزی/نانی زەرگ لێدان/نانی کۆسەکۆسانێ/ نانی ڕێگری و ڕاووەڕووت/نانی فیشەک دزی وهتد.

بـــەڵام هەرکەســـێک تەنها جارێک تام وبۆنـــی نانی دزی و ڕێگری نەکردبێت؟! هەرگیزنازانێ چەند بەتام بۆو لەزەت و چێژدارە، ولاشـــی ماچ و ڕامووســـان نییە، ئەگەر لەژیاندا تەنهـــا یەکجار تامی بکەی؟! ئیدی تەواو، بڕیت بەهیچ نانێکی دیکە ناشـــکێ، ئەگەر ڕۆژێ لە ڕۆژان تۆبەی (نسوح) یش بکەی؟! نەخێر وەکو شۆربا خۆرەوەی قوونە تەکیەو خانەقا چاوت هەرلێیەتی، هاوچەشـــنی کابـــرای خزمەتکارو خواردنی

بەرمـــاوەی ماڵی ئاغا، دەگێڕنـــەوە دەڵێن: (کابرایـــەک خزمەتکارو نۆبەداری شـــەوان بوو لەماڵی ئاغا، هێـــواران دەچووبەرماوەی ماڵی ئاغای دەخوارد، ڕۆژێکیان لەدوورەوە میوانێکی زۆر ئازیز و خۆشەیست و گیانی بەگیانی دێت دەبێتە میوانی، لەســـەر پایەندازی ئەم میوانە ڕێزدارە قەڵەموونێکی خرتی بۆ دەکوژێتەوە، بەهاوســـەرەکەی دەڵێ: بەپـــڵاو ســـاواری لێبنێئیدی هێـــوارێ لەگەڵ میوانی خۆشەویســـت لەسەرســـفرەی خوان دادەنیشن، پڵاو ساواری دادەنێن، ئەمما چ پڵاو ســـاوارێ؟! بەدۆنی خۆماڵی دەبریقێتەوە، ســـینگ و ڕانە عەلەشـــیش بەسوورەوەکراوەیی لەسەر پڵاو ساوار داندراوە، هەرمەپرسە؟! مردوو بیخوات زیندووی دەکاتـــەوە، کەچی مامەی خزمەتکار، فکرو هۆش و بیری هەرلەلای بەرماوەی ماڵی ئاغابوو، دەســـتی نەدەچووێ دەســـت بۆئەم نیعمەتە زەریفە درێژبکات، کێچ دەکەوێتە کەوڵی، ناچار دەڵێتە کابـــرای مێوان: تۆ، ناوی خودای لێ بێنە نانی خۆت بخۆ، من بۆکاری پێویست هەتا ماڵی ئاغای دەچم و دێمەوە، هەیپای لێدەکات بۆ ماڵی ئاغا، دوو، ســـێ کەوچک لەچێشتی بەرماوە دەخوات دڵی دادەکەوێ، دواتر دەگەڕێتە بۆ ماڵ، لەگەڵ میوانەکەی شێو دەکەن.)

جابەندەی بچوکتـــان لەلوولەی ئەم دەمانچە پلاســـتیکییەوە تام و لـــەزەت و چێژم لەدزی و ڕێگری وەرگرتبوو، لەســـەری ڕاهاتبووم، ئەســـتەم بوو وابەسووک و سانایی دەســـتبەرداری بم، بۆیە هەرکاتێ کەبۆ دزی و ڕێگری دەچووم وامدەزانی بۆ گۆڤەندوشایی ڕەشبەڵەک و زەماوەندی بووک گواستنەوە بانگهێشت کراوم،

: ئاخر تـــۆ وەرە پێمبڵێ بزانم ئەم چەکە نەفرەتییە بۆچی هێندە بەسام و هەیبەت و تۆقێنەرە؟! ئاایکەتۆقێنەرە، ئاژەڵ بەئاژەڵاتی خۆی لێی دەسڵەمێتەوە، هەست بەخەتەرناکی دەکات، نەخاسمە مرۆڤ.

ئەوجا کەلەهێکەوە لوولەی دەمانچەم دادەنا بنا گوێی هەرکەسێک، دەســـت بەجێ ڕەنگی ڕووی دەپەڕی، نتەی بەردەدا، خودا شـــاهێدە

پیاوی وام ڕووت کردووە، ئەگەر زانیبای ئەم دەمانچەیە پلاسـتیکە؟! وەکو پڵینگ ئاسـای تێکوپێکی دەشکاندم، وابوو جارێکیان پیس لێم قەوما، دواتر بۆتان دەگێرمەوە.

مانگی ڕەمەزان بوو، ڕەمەزان دوولاقی شکابوو، لاقێکیشی تەکەتەکی بوو، گوێم لەخەڵک و دانیشتوانی گەڕەک دەبوو، دەیانگۆت: (مجێور) ێک هەیە مەندیلەکی لەسەری خۆی ئاڵاندووە، چەند ئایاتەکی قورئانی ئەزبەرکردووە، گوایە (مەلا)یە، پارشێوان دەچێتە مزگەوت موسڵمانان ئاگاداردەکاتەوە هەسـتن لەخەو پارشێو بکەن سەرانیش چادەکاتەوە لەڕۆژووانی ئافرەتی موسڵمان دەپرسی: ئایا دووگیانە؟! ئەگەر گوتبای بەڵێ.

پێـی دەگـوت: بەپێی شـەرع دەبێ سـەری ئـەو مەخلوقەش چابکەیتەوە)

:ئـەو مەخلوقەی هێشـتا لەدایک نەبوو بوو، هەوای سـەردنیای هەڵنەمـژی بـوو، فێری درۆو دەڵەسـەو کەڵەکەبـازی و قۆڵبڕین و گەندەڵکاری و حەرام خواردن نەبوو بوو، مەگەر خودا بۆ خۆی بزانێ، ئەگـەر ناکێ دەزانێ ئەم مەخلوقە دەژی، یان هەر بەمردوویی لەدایک دەبێ؟!

لەدڵـی خۆمدا گوتم: دەردت لەگیانم مجێـور، بابۆت بمێنێ هەتا ڕۆژت دادێ، پێشـر گوتم ڕەمەزان دوولاقی شـکابوو، لاقی سێیەمی تەکەتەکی بوو، یانی ئاخرو ئۆخری تەمەنی مام ڕەمەزان بوو، ڕۆژێکیان بەڕۆژەوە دەورو خولی ماڵی مجێورم دابوو، ڕێ و شوێنم دەست نیشان کردبوو، بەکوێدا بڕۆم بۆخزمەت جەنابیان، خۆپێشـینان لەختوخۆڕا نەیانفەرمووە!

(قەڵای مێردانەشـەو)، ماڵی مجێور شان بەشانی مزگەوتەوە بوو، دەمزانی جەنابیان لەکاتژمێر چەند لەدەمەوسـاتی پارشـێو دەچێتە مزگـەوت بۆخوێندنی قورئان تاکو موسـڵمانان وەئـاگا بێنێ لەخەو

هەڵسن پارشێو بکەن بەڕۆژووبن، جائەو شەوەی کەخۆم ئامادەکردبوو بۆگیانی مجێور، شەوێکی ئەنگوســتە چاوبوو، هەور زگی گەیاندبووە عاردی، نم نم دەیپرووشــاند، دەمانچەی گۆرینم خســتە بەر پژدێنم، جەمەدانیــم لەچەک کرد، کلێتەم بەســەر داهێنــا، تەنها کونی چاوم دیاربوو، چــووم لەبەرامبەر نەینۆکی قەد دیواری ژووری ماڵی خۆمان ڕاوســتام، سەیری خۆم کرد، خۆم نەدەناســییەوە، دواتر بەئەسپایی بــۆی دەرچووم، مەلا پێــش چوونی من چوو بوو بۆ مزگەوت قورئانی دەخوێند، کەلەماڵ دەرچووبوو دەرگای حەوشەی بەدوای خۆیدا گاڵدا بــووەوە، بەڵام لەدیوی ژوورەوە ڕەپێش نەکرابوو، بەئەســپایی خۆم خزاندە حەوشە، لەقوژبنەکی خۆم مات کرد هەستم ڕاگرت هیچ جوولەو تەقــەو ڕەقە لەئــارادا نەبوو، کش مات، لەم بێدەنگییەی ئەم ســاتە وەختەدا، لەدڵی خۆمدا گوتم:

:ئەگەر بەسەهودا نەچوویم؟! لەوانەیە دوای ئەوەی ئەرکی سەرشانی بەجێ دەگەینێ، بەئاگادارکردنەوەی موسڵمانان تاوەکو هەڵسن پارشێو بکەنکەدیتــەوە لەچکی کــەوای بنێتە ژێر نیفــۆی دەرپێی، لەجیاتی خاتوون بەخۆی پارشــێو ئامادەبکات، لەم خەیاڵۆکە دابووم، مجێور دەنگــی برا، زانیم دێتەوە، خۆم بۆی ئامادەکرد، بەهێواشــی دەرگای حەوشــەی کردەوە هاتە ژوورێ، بەدوای خۆیــدا دەرگاکەی پێوداوە، خەریک بوو پشــکەی شمشــێرەی ڕەپێش بکات، بەئەسپایی لوولەی دەمانچەم داناسەر ڕیشەی ملی، پێمگوت:

دەنگت لێوە نەیێت ماڵۆس، ئەگینا ســاردت دەکەمەوە، زمانی تێک ئالاّ، دەستی بەخۆیدا شۆڕکردەوە، لەجێوە سام گرتی بوو، هەمووگیانی وەک شــەنگەبێ نــاو ئاو دەلــەرزی، پێمگووت: بــێ چەندوچوون و خۆبادان هەرچەند پارە و پوولی زەکات و سەرفترەی سەرچاکردنەوەی موســڵمانان، کەلــە مانگی ڕەمەزان لەخەڵکی هــەژارو کەم دەرامەت وەرگرتووە، بێنە یەکجێ ڕەتی کەوە،؟!

ـ گوتی کوره باوکم پیاوی چاک به، لەخودا بترسە، ئاخرکەسیش نا بابایەکی وەکو من دەســـت و پێ ســـپی، کوو ویژدانت لێت قبووڵ دەکات؟!

ـــ ئەم نەزیرۆکانە نک من پارەو پوول ناکات، بۆخودا پێت دەڵێم، ماتەڵم مەکە، ئەگەرناقسەی پێم برِی گوتی:

ـ ناوی خودا بێنە لەکەلی شەیتان وەرە خوارێ،

ـ مجێور، ئەوەش مەکە بەئیشـــی شەیتان، خۆت دەزانی لەمانگی رەمەزاناندا شەیتانەکان زنجیر بەند دەکرێن،

: لەبـــەرە خۆی دەیگوت، لاحەولـــەوەلا قوەتە ئیللا بیلاهـ عەلیول عەزیم، دواجار گوتی:

ـــ لێم گەرێ بابچم کابانی ماڵ بەئـــاگا بێنم، پارەکە ئەوەی هەیە لای ئەوە.

ـ باشە، مادام یاڵڵا پێشم کەوە،

ـ ئاخر منداڵەکانم هوردن، بەم حاڵەوە بەدەست و دەمانچەوە بت بینن زارەترەک دەبن، زراویان دەرژێ لەترسان.

ـ ئەوە پەیوەندی بەمنەوە نییە، گرفتی خۆتە.

ناچـــار بەهێواشـــی دەرگـــەی ژووری خەوتنی کـــردەوە، منیش دەمانچەم لەســـەر تەپلی سەری راگرتبوو چووینە ژوورێ، بەئەسپایی نەبادا منداڵەکان بەئاگابێن، دەســـتی گەیاندە لاق و لەتەری خاتوون، بەســـرتە! (ئافرەت ئافرەت) بانگی دەکرد، ژنە هەرلەجێوە کەلەکەی گۆری گوتی! (وازم لێ بێنـــە تاقەتی ئاوگەرم کردنم نییە و نەفتیش نییە)

:خەریک بوو لەتریقەی پێکەنین بدەم.

رِایەژانـــد پێی گوت: هەســـتە کچێ، ئاوی چی و ترخێنەی چی؟!

ژنە هەرلەجێوە نیوەراست بووەوە، نەختێک چاوی هەڵگلۆفت، چاوی هەڵهێنـــا، کەچاوی بەدەســـت و دەمانچەی من کـــەوت، خەریک بوو

بزروکێنێ، مجێور دەســتی هاوێتە سەردەمی توووند دەمی گرت، پێی گوت: وسبە، مەقیژێنە، بامندالّەکان زرخەون نەبن، ژنە پرسی:

ـ ئەوە چییە؟ ئەم پیاوە کێیە؟! چی دەوێت.؟!

ـ ئەوە شەیتانە، زنجیری پساندووە رای کردووە، هاتووە داوای پارە دەکات، بێنە هەرچی هەیە لەپێشـــی دانێ، نەبادا بیتەقێنێ منالّەکان هەتیووبن، تۆش دووچاری بێوەژن کۆشـــی بـــی، ئەوەیان خراتر، ژنە پریاســـکەیەکی لەبن بالیفی ژێر سەری دەرهێنا گوتی: هابگرە بیدێ، بەســـندان و قوزەلّقورت بێت، ئیتر پارەکەم لێیان وەرگرت، دەرگاکەم لەسەریان داخست، لەکولانکەی دەرگاوە بانگی ژنەم کرد، پێمگوت:

(مەنجەلّۆکێک ئاو بۆ مجێورە فەندی گەرمکە، رەمەزانە خێرتەگاتێ.)

گوێم لێبوو گوتی: ســـەگبابی بێ چـــاوە روو خودا عالیمە چاوو رووی بەمیزکەر شۆراوەتەوە

:من زەبری خۆم وەشـــاند، داخم کـــرد، هەتا لەژیاندا مابێ هەموو مانگـــی رەمەزانان، هەرگاڤەکی کوێ بیســـتی زاراوەی رەمەزان بێت، وەک لارەشـــە لەنووکەوە لێی وەبن دەداتـــەوە، جادەڵێ! چاووپرووی بەمیزی کەربەمیزی بەرازبەمیزی مەیموونبەمیزی حوشـــتربەهی سەگ و پشیلە شـــووراوەتەوە، هەرچی ئەو دەڵێ، بابیڵێ، ئەوا بەدەردێکی وادەتلێتەوە، خۆی، خۆی دەخواتەوە.

-٨-

پێویستە لەسەر مرۆ، بەرلەوەی بچێتە مەیدانی سوارسوارانانێ بۆ پێشبڕکێ و قۆشمە قۆشمانێ، دەبێ بزانی ئاخۆ ئەو هەسپەی لەژێر دایە تاچەند خۆشبەزە؟!

بەڵێ من لەزووێکەوە ڕەملی ئەوەم لێدابوو، دەمزانی ئەم دەمانچە پلاستیکییە دووچاری سەر ئیشە و گۆبەندم دەکات، دوو بەقەد ئەوەی شادو شەنگۆڵی کردووم، ڕۆژێک دادێ لەکونەکەپوومەوە پێم قەیدەکاتەوە، تەنەکە بەکلکمەوە دەکات، بەڵام واچاکە بۆ مرۆ تائەو ڕۆژەی لەژیاندا مابێ وەکو کەڵەشێر بژی، هەردەم بانگ بدات، نەک لەترسی زەبرو زەنگی ڕۆژگار دەست بەکڵاوی خۆی بگری بانەیبات،

ـ با، کڵاوی کێ دەبات؟!

کڵاوی پیاوی ترسنۆک و قەڵە زراو دەبات،

مـن، لەزووێکەوە دەسـتم لەکڵاوی خۆم بـەرداوە، دەیبانایبا؟!

فلقیرو جەهەننەم، بابیبات،

دنیایەکی ســـەیرە، هەموو درندەیەک گۆشـــتخۆرە، کەچی تەنیا نـــاوی گورگ بەدە، ئێمە خرعەیب دارین، نەک هەر عەیب دارو بەس، بگـــرە هەرهەموومان دزین، ئەگەر وانییە؟! هەرکەســـێک دەڵێ: من دزنیم، ویژدانم ئاسوودەیە؟!

(مەبەست لەم کەسانەیە کەسەرە پەتکیان بەدەستەوەیە)

بابێ سێ بەردی لەمستی دەنێم، هەنگێن ئاشکرادەبێ کێ دزە؟! بگرە نەک پەتک بەدەســـت، هەرکەسێک جورئەت بکات، بێ سوێند بخوات بڵێ: من دزنیمن دڵنیام کەدەمی ناگاتێ، بۆیە ئێژێ تورشە، یان کابرایەکی مردەلەی دەســـت وپێ سپی قەلەزراوە، واتا ئەو کورە نییە دەست لەهەمووکونان رابکات.

لێتـــان ناشـــارمەوە مـــن دزم، کرێچیم، کرێچی هەیبـــەت خانم، لەگەرەکی (کەندە کۆخ) لەشـــاری هەولێر، نزیک بنکەی پۆلیســـی (لاخەبەر)، لەمنداڵێکی تەمەن شـــەش ســـاڵانەوە تـــا دەگاتە پرو پیرەژنەکانی گەرەک و پۆلیســـەکانیش دەمناسن، دەزانن چ زاتێکی پیرۆز و دەستپاکم، مریشک وکەڵەشێرو کۆترم بۆیان نەهێڵاوە، وەلێ سەدحەیف و مخابن لەم وڵاتەی ئێمەدا گۆشتی سەگ ناخورێ، بۆیە پارە ناکات، ئەگەر پارەی کردبایە؟! خۆم لەقەرەی دزینی ســـەگیش دەدا، بازرگانەکانیش یەک بســـت چییە؟! بەســـەردا بازیان نەدەدا، هەوڵی قۆرخ کردنیان دەدا، لەگەڵ وڵاتی کۆریا و تایلەند بازرگانییان پێوە دەکرد،

من، دزی دەکەم، بەڵام ویژدانم ئاســـوودەیە، بێ ویژدانی ناکەم، ئەم شەو خۆم تێدەکەم شتێک دەدزم، دواتر دەیفرۆشمەوە بەقنیاتەوە پارەکـــە خەرج دەکەم، تادوا ماقرِی لێدەخۆم، بەڵام مرۆ، قەت نابێ بەهۆی مەیسەر بوونی کاروپیشەکەی لەخۆبایی بێت، نەخاسمە کاری

دزی و ڕێگــری، بەهۆیەوە لاف لەســەر خەڵکی هەژار و بێ پشــت و پەنــا لێبدات، وابێ پڕو پیرەژن منداڵی نــاو لانکی پێ بخەوێنن، لەیادمە! ڕەحمەتی دایکم تــازە لەمەمکی کردبوومەوە، تا درەنگانی شــەو دەگریام نەدەخەوتم، خەوم لەچاوی دایکیشم حەرام کردبوو، دایکم دەیگوت: شەوە چاوت بقووچێنە بنوو، ئەگەرنا، دز دێ لۆخۆی دەتبات.

-٩-

بەرە بەری نوێژی شـێوان بوو، بەشل و خاوی بەرەوماڵ دەبوومەوە، دنیـا ئەنگورە بـوو، لەهەوراز بنکەی پۆلیسـی لاخەبـەر، نیوچەوانم لەنیوچەوانی کابرایەکی بیانی سـوورفەل چەقی، جەنتایەکی بەلاشـانی دادابوو، پارچە کاغەزێکی بەدەستەوە بوو، ناوە ناوە سەیری کاغەزەکەی دەکردو پاشـان چاوی بەدیـوارو ئەملاو ئەولادا دەگێـڕا، بەمەزەندەی خـۆم، پێموابوو کە ئەم جانتایەی شـانی لێوان لێـوە لەپارەو پوول، کەوتمە خلێلەو قرت پرت، دوو، سـێ جار شـەیتانم بەنەفرەت، نەخێر، تەمـاح گیریـووم، هێواش هێواش پـێ بەپێی کابرای بیانـی بەدوایدا ڕۆیشـتم، پێچایی بوو، کەلەپێچاییەکە سـووڕاوە، تاریکایی بوو، چیدی خۆم پێنەگیرا، لەپشـتڕا لوولەی دەمانچەم دانابان ڕێسـەی ملی و تێم ڕاخوڕی! هەردوو دەسـتی بەرزکردەوە، هەندێـک ورتەورتی لێوەهات، دەیگـۆت: (ئۆکەیئۆکەی) ئەگینا هیچی لێ حاڵـی نەبووم، جانتاکەیم لەشـانی کردەوە، پاشان بەئیشارەت تێم گەیاند! ڕووبکاتە دیوار، پشتی

هنگێ دەستێکم بەگیرفانی کراس و پانتۆڕی داهێنا، هەندێک پارەی هوردە و هیچی تر، پشیلەکم بەجانتاکە خۆش بوو، جانتام بردو بۆی دەرچووم، بەهەڵە داوان خۆم گەیاندە ماڵ، کەزارکی جانتام کردەوە، هەناسە ساردبووم، هەزار جنێوم بۆ ئەبوئەژدادی کابرای حەواڵەکرد هەرئەو ئێوارەیە هێشتانەکێ نەخەوتبووین، هاکادیتم پۆلیس بەحەوشەی وەربوون، بێ چەندوچوون قۆڵبەستیان کردم، پەلکێشیان کردم بۆبنکەی پۆلیسی لاخەبەر، بردمیان بۆ ژووری ئەفسەری بنکە، دیتم کابرای بیانی قیت قیت لەسەر کورسی دانیشتووە، کەچاوی بەمن کەوت، بەدەست ئاماژەی دا، سەری بۆ ئەفسەری بنکە ڕاڵەقاند گووتی (یەسیەس).

تومەز ئەفەندی هونەرمەندی شێوەکارە، دوای ئەوەی هیچم پێ نەهێشت، یەک سەر چاوی دابووە بنکەی پۆلیس، داوای قەڵەم و قاقەزی کردبوو، دواتر پوختەو جوان وێنەی من و دەست و دەمانچەو کو بەڕێوە دەڕۆم، بەسەرلای چەپدا دەلەنگم، کتومت دروستی کردبوو، دابوویە دەستی ئەفسەری بنکە، لەدڵی خۆمدا گووتم: نەخێر، گرفتاربووم.

لەدەست پێکی پرسیارو لێکۆڵینەوە ووەلامدانەوەدا لەبەرامبەر ئەفسەری بنکەدا، زمانم بستێک درێژبوو، خۆم گیف دەکردەوە دەمگۆت:

(کەی ڕەوای هەقە بەقسەی کابرایەکی بیانی کەس نازانێ! گاورەئاگر پەرستەلەوانەیە گاپەرست بێ هاتوون قۆڵبەستم دەکەن، بەپاراسووان ڕاپێچم دەکەن بۆبنکەی پۆلیس، گوایە کابرایەکی بینانیم ڕووت کردووە، بەویژدانتان سوێندتان دەدەم، ئایا بابایەکی شەل وگێڕو وێڕی هەژاری وەکومن، ئەو پیاوەیە ڕێگری بکات؟! تڕحێو، وەڵڵا بابەخۆش، بەڕاستی ڕێگرتان گرت.

ئەفسەری بنکەی پۆلیسی لاخەبەر، وێنەی دەستکردی من، ئەوەی کابرای بیانی دروستی کردبوو، ڕادەستی من کردو گوتی: ئەم وێنەیە، وێنەی کێیە.؟! کەچاوم بەوێنەکە کەوت وێنەی خۆم بوو، لەدڵی خۆمدا گوتم: (هەی سەکی سەگباب دەڵێی: نان و پیازو دۆی لەگەڵە من خواردووە، ئافەرین زەلام بۆ هۆشمەندیت، ئەتو کو بزانی ئەوها بەڕێک و

پێکی لەسەر کاغەز بەم دەمودەستە شکلی من دروست بکەی، لەبەرامبەر ئەم گەواهیدەرە بێ زمانە، زمانم لەگۆ کەوت، دەمم بەشبۆوە بووە تەلەی تەقیوتێفکریم! نەخێر، پارەوپوول ناکات، بەتەڵەی وەبووم، دەڵێن:

(قسە کەوتە زارەکی کەوتە شارەکی) ڕاستە، دەلحاز دەنگوباس بڵاو بـــۆوە، ئەوکەســـەی دزی و ڕێگری و جەردەیی دەکـــرد، کەوتۆتە داوی پۆلیس، لەبنکەی پۆلیســـی لاخەبەر دەســـت بەســـەرە، بۆ بەیانی ڕۆژی ئایندەو دواتر، ڕۆژانـــە خەڵک دەهاتن بۆ بنکەی پۆلیس دەهاتن، خەڵک چۆن بۆ وەخت ڕابواردن دەچنە باخچەی ئاژەڵان، لەودیوی قەفەزەکانەوە سەیری ئاژەڵان دەکەن، بەهەمان شێوە سەیریان دەکردم،)

جەنابی ئەفسەری پۆلیس لەکاتی پرسیارو لێکۆڵینەوەدا، پتر جەختی لەسەر جانتاکەو دەمانچەکە دەکردەوە، بڕوای نەدەکرد کەمن بەم دەمانچە پلاستیکە ئەم بیانییەم ڕووت کردووە، دەیگوت: (درۆ دەکەی، پلاستیکی چـــی؟! وادەزانی ئێمە» لەگوێـــی گادا خەوتووین» خەیاڵ نەکەی! بفڕێ بچیە بن پەڕەکەی هەوران، یان بچیە ژێر زەوی، ئەم دەمانچە چواردەخۆرە و ئـــەو جانتایەو هەرچی تێدابوو دەمەوێ)، جەنابی بڕوای بەقســـەی من نەدەهات کەدەمگوت: (جانتاکە هەندێک پسکوێت و بنێشت و دەستەسڕی کاغەزی چڵم سڕینەوەو کاغەزی قومارو هیچی تری تێدانەبوو، زۆر نەباوڕ بوو، پێیوابوو کەکابرای بیانی پارەوپولی زۆری هەڵگرتووە، بەمەزەندەی خۆی وای دابووە قەڵەم، کەمن دەســـتە گوڵی خۆم لێداوە، بەڵام پێگیری دەکەم، پـــێ لێنانێم، تمەزە جەنابی مرخی خۆی لەپارە خۆشـــکردبوو، منیش دەمگوت (ســـەگ و سەگبابی لەبرسان مردوو، لەبرسان پەڕاگەندە بـــووە، پارەی چی؟! تەڕەحەڵوای:؟! ئەســـلەن بەخۆی دزە، دەفەرموو، لێی بکۆڵنەوە، ئێجا ئاشـــکرادەبی کێ دزە؟! مـــن دڵنیام ئەم گاور بابە بەدوای دزینی کەلوپەلی گران بەهای کەلتووریدا دەگەڕێ، بەناوی ئەوەی گوایە ئەفەندی گەڕیدەیە، باشە، ئەگەر ڕاستە جەنابی گەڕیدەو گەڕۆکە، بۆچی جانتاکەی ماقڕی سۆتی تێدانەبوو؟! ئەم قەحپەبابە سەری منیشی لەقوڕنا).

بەڵام جەنابی ئەفســـەر، بەم حەتەلــۆک و مەتەلۆکانەی من، هەرگیز گریانـــی نەدەهات، زۆر تورەبوو، دەهات و دەچوو لێوی خۆی دەکرۆژت، دەیگوت:

(لەفەلاقـــەت دەدەم لەبـــن داران دەترزێنمەوە، دەبـــێ کارێکی وات پێبکەم بە (ئاتەدۆم) نەکرابێ، وەلێ هەرچەندی کردی و کۆشـــای، خۆی هێناوبـــرد، نەخێر، بێ هـــوودە بوو، لەخۆی وەڕس بـــوو، زمانی گۆڕی گوتی:

(باشە، دەمانچەکەی لێدەردەکەین، بەڵام ڕاست و ڕەوان پێمبڵێ بزانم چەند پارەو شتی گرانبەهای تێدابوو؟! ئەگەر درۆم لەگەڵ نەکەی؟! منیش یارمەتیت دەدەم، وابێ بارت ســـووک بێت، وادەکەم کابرا لەســـکاڵاکەی پاشـــگەز بێتەوە، شتێکی وات بۆ دەنووسم بۆ بەردەمی دادوەر لەدادگا، وابێ ئازاد بکرێی، پاشان خۆم و خۆت قسەی لێدەکەین،

ـ ئێستا دەڵێی چی؟!

: پێکەنینم بەقســـەکانی ئەفســـەری بنکەی پۆلیسی لاخەبەر دەهات لەدڵـــی خۆمدا دەمگوت: دەقـــاودەق ئەوەیە کەدەڵێـــن: (بەدوای ناڵی کەری تۆپیـــدا دەگەڕێ)خۆزگە! جانتای گۆرین لێوان لێو دەبوو لەپارەو شـــتی گران بەها، چمە قولابیان لە قرتقرتۆکم گیرکردبایە؟! یەک فلس، یەک ماقرم لەســـەر ڕۆحی باوکی ئەفســـەر دادەنا، وەلێ ئاخ، دەســـتی شکاوم، ڕەنج بەخەسارببووم، سەگبابی ڕووتەڵە بەخۆی قۆڕەی زگی دێت لەبرسان، پارەچی وتڕخێنەی چی.؟

ـ قوربـــان تێت ناگەم، لەبارەی چییەوە قســـان دەکـــەی؟! ئەگەر مەبەســـتت لەجانتای گۆرینە؟! ئەوە لەلای خۆت ڕاست و چەپ خەتێکی پەلەدەولکی بەسەردابێنە.

ئەم وەڵامە لەهێسکی کاری کرد، لێم دەهری بوو، نیوچەوانی گرژبوو لۆچـــی تێکەوت، لێمی توند کرد گوتی، شـــەلەی بەدفەڕی قوون خوار، شـــەرت بێ لەســـەر ئەم کەللەڕەقییەت دەبێ بیخۆی، پێت دەتفێنمەوە، دەتدەمـــە دادگا، وات بۆ تێدەکۆشـــم وەبی لەبەندیخانـــەدا بڕزێیتەوە،

جەستەت کرمی بکەویتێ، هەنگین دەتبینمەوە چتۆ مرۆیەکی چەلەنگی؟!
پاشان کو هەڵیدەگریەوە.

ئیتـــر کار گەییـــە دادگاو بەردەمی قازی، خودا هـــاوار، کاتێ قازی بەپەروەندەی سکاڵاکەدا چۆوە، بەبنج و بنەوانی کێشەکەدا کەوت، ئەویش تەماحگیربوو، گەرەکی بوو بەئاسانی بێتە سەر حازرەکی، ببێتە شەریک و برابەش، ئەوەیە کەدەڵێن: (ئەوەی لەتوخمی مشـــک بێ هەنبانە درە) جەنابی لەسەرەتادا زۆر بەشـــێنەیی پرسیاری لێمکرد، دەیگوت: کورم، دەبێ ڕاست و ڕەوان بێ گرێ وگۆڵ و پێچ و پەنا، پێمبڵێ بزانم جانتاکە چەند پارەوپووڵ و شـــتی گرانبەهای تێدابوو؟! چت لێکرد؟! ئەگەر نەت فەوتاندوون؟! پێمان بڵێ بزانین لەکوێ تەقەتت کردوون؟!

: دەوەرە جۆتە گونی بگرە دەســـتنوێژت نەشکێ، من دەڵێم: نێرە، ئەوان دەڵێن:بیدۆشە،

ســـەیر لەوەدابوو، هەرچەند جار پەلکێشیان دەکردم بۆ لێکۆڵینەوە، دەمانچەی گۆڕین لەســـەر مێزی بەردەم قازی بوو، لەسەر پەروەندەکەم داندرابـــوو، کەچاوم پێدەکەوت کردەوەکانـــی خۆم دەهاتنە پێش چاوم، وابوو جارێکیان!

دەمەدەمی مەلا بانگدان بۆ نوێژی بەیانی خۆم پێچابوو، بەئاســـتەم کونی چاوم دیاربوو، لەپێچایی ســـەرە کۆلانێک، سەرە ڕێی گەرماو بوو، تاریکایی بوو خۆم دانووســـاند، بەڵکو کافر کوژەک زەبرێکی وەشاندبێت ڕزقـــی ئەمرۆی بە نیوچەوانیـــەوە بێت، لەم خەیاڵانەدابـــووم، هاکادیتم یەکێک بەکراس و بێجامەی خەت خەت بووخچەیەکی نابووە بن هەنگڵی، جگەرەیەکـــی بەلالێویـــەوە وەگرتبوو یاغـــر یاغر دەهـــات، گوێم لێبوو لەبەرەخۆی منگە منگی بوو گۆرانی دەگوت، دیاربوو ئەم شـــەو لەغەزاو کافر کوشـــتن شـــیری تیژبووە، بۆیە دڵ خۆش بـــوو، لەپرێکەوە وەکو ڕموونن پێشـــم لێکرتەوە لوولەی دەمانچەم نایە سەرتەختی نیوچەوانی، لەجێوە چەقی، ســـامگرتی بـــوو، پێمگوت: ڕووتبە ســـەگباب، وادیارە لەدزی دێیتـــەوە، مەگەر خودا بزانێ ئاخۆ ماڵـــی کێت کاول کردووە؟!

نەمهێشــــت وەڵام بداتەوە، لەبووخچەکە ڕووبووم، بووخچەکەم لەدەستی ڕاستاند، قورس بوو، ســـەعاتێکی لەمەچەکی دابوو، ئەویشم لێ ستاند، لێم پرسی:

- چ کارەی کورە.؟!

- کووتاڵفرۆشم.

-باشە، بەم بەیانییە زووە، لەکوێوە هاتی و بۆ کوێ دەچی.؟!

- لەماڵەوە بۆ گەرماو.

ـــ وادیارە خانم ئاوڕێکی لێت داوەتەوەها.؟! بێدەنگ بوو، دواترخۆم لێ توندکرد، پێمگوت: قۆڵبڕ، پەڕۆو پاتاری عەنبارە سۆت دێنن، بەسەر هەژاراندا ســاخی دەکەنەوە و دەچن لەڕیزی پێشەوە لەپشت مەلا قامەت دەگرن، یاڵڵا برۆ دەی، ئاوڕ نەدەیەوە، ئەگینا کارت تەواوە، بائەوەشــت پێ بڵێم! ئەگەر شەوێکی تر چوویتەی غەزاو کافر کوشتن، هەرلەماڵەوە لەگـــەڵ خانــم پێکـــەوە گەرماوبکەن خۆشـــترە، نەک وەکـــو ئافرەتی ڕەدووکەوتـــوو، بووخچە بخەیتە بن هەنگڵت، بەخـــۆت لەخۆت لەهەڵڵا بدەیپرو پیرەژنانی گەڕەک پێ بزانن.چییە؟! ئەمشەو کابرا چوویتە غەزا کافرێکی کوشتووە.

کابرا، بەئەوەندە مەمنوون بوو، ئیدی قوچاندی ڕۆیی.

دواجار کەپەلکێشــیان کردم بۆ بەردەم قازی، زڕتەبۆزی بیانی لەوێ ئامادەبوو، لەســـەر کورسی دانیشتبوو، دیقەتم دایێ! پانتۆڵەکی کورت، هەتا هەوراز ئەژنۆی داپۆشـــی بوو، کراسێکی خۆڵەمێشی، چاوی مەیلەو زەردبـــاو، لەچاوی (بۆ) دەچوو، یەک تۆپەڵە بنێشـــتی لـــەزاری دابوو، خۆشـــخۆش کاوێژی دەکرد، نازانم ســـەگباب کو کارێژی شل نەدەبوو؟! قـــژی ســـەرورپیش و ڕدێنی تێکـــەڵ وپێکەڵ ببوو، مەپرســـە؟! بڕواتان بێ (حەمەشـــێت) ی ڕەحمەتی لای خۆمان یادی بەخێر لەچاو ئەم کابرا بیانییە، پاشابوو.

ئیدی باگێژتان نەکەم، دیســـان پرســـیارو وەڵام لێکۆڵینەوە دەستی پێکردەوە، بەڕێزیان پرسی

- ئەم مرۆمرۆڤە دەناسیەوە.؟!
- نەخێر، نایناسم،
- چۆن نایناسیەوە.؟!
- قابیلە نان و پیازم دەگەڵی خواردووە، نایناسم،
(باشـــە، تۆ بەرلەوەی ڕێ لەم پیاوە بگـــری، بێگومان زانیت کەئەم پیاوە هاونیشتیمانی نییە، کابرایەکە بیانی گەڕۆک، چۆن دەستت چووێ، ڕێی لێبگری ڕووتی بکەی؟! ئاخر ئەوە، سبەینێ کەدەگەڕێتەوە بۆ وڵاتی خۆی، لەڕۆژنامەو گۆڤارەکاندا لەســـەرمان دەنووســـێت، دەڵێ: خەڵکی فڵانـــە وڵات هەرهەموویان دزو جەردەو ڕێگرن، ئەوە ســـووکایەتییە بۆ ئێمەی نیشـــتیمانپەروەر و وڵاتپارێز، بۆیـــە ئەگەر هاوڵاتییەکی خۆمانت ڕووت کردبایە؟! گەلێک ئەشـــرەفتربوو، لەوەی شەرمەزاری گەڕیدەیەکی بیانیت کردین، چونکە هەرچەند تێدەفکرم، کارەکە ئاڵۆزو پاڵۆزە، نازانم بەچ شێوەو شێوازێک قەرەبووی ئەم میوانە بکەینەوە؟!
لەدڵـــی خۆمدا گوتم: باشـــە جەنـــاب، کێ هەیە لەئێمـــە دزنەبێ؟! هەرکەســـەو لەپەنایەک، لەپشـــتی پەردەیەک دزی دەکاتسوێند دەخۆم هەرکێ؟ سەرەپەتکەکی بەدەستیەوەیە، بێگومان دزە، خودی خەزنەدار بەخۆی دزە، ئەگەر گەورە پیاوانی پەتک بەدەستی وڵات دزنەبن؟! دەست و پێوەند هەرگیز جورئەت ناکەن دەست بۆ زلە پووشێک ببەن، (گەورە دەرژێنـــی گچکە پێ لێدەخشێنی)بەســـەدان پیرەگورگ و بێچووە گورگ بەرهەڵدرایتە گیانی ئەم ڕەش و ڕووتە، وەکو حەم حەم هەرتێدەپەستن، وەک ئەوەی تێرنەخـــۆرە بانگی کردبن قەت و قەت تێرنابن، هەردەڵێن: بابێلەم ورێنانەدا بووم، جەنابی گوتی:
- دەزانی ئەمرۆ دواجارە دادگاییت دەکەم؟! جائەگەر ڕاست و ڕەوان پێ لێ بنێی، جانتاکە چەند پارەی هیشکەو شتومەکی گرانبەهای تێدابوو و چت لێکرد؟! ئەگەرنا، ناچار دەبم سزایەکی قورست بەسەردا بسەپێنم، حاڵی بووی؟!
:لەدڵی خۆمدا گوتم: قیری سیاە، بابۆو دۆشاوی تێکەڵ بکەم، چونکە

دەزانم جەنابیان لەکونەڕەشەم دەپەستێ، وەی بەگونی بارگینم، بەخێزی ناوزارم گەرووی خۆم تەڕکردەوە، لەوەڵامدا گوتم: بەڕێز تۆ سەیرێکی ئەم پیاوە بیانییە بکە! بەخۆیی و بەلاق و لەتەر قوون و پانتۆڵی کورتی کتومت (مەتێ)ی سەکوژە، ئەم شەحتۆیە، ئەگەر پارەدار بووایە ئەم جلانەی دەپۆشی؟! دەقاو دەق لەجلی تاژییەکانی (سەرۆ نۆم) دەچێ، هەستم پێکرد جەنابیان لەژێر لێوان دەگرژییەوە)درێژەم پێدا گوتم سەگبابە دەڵێی بنەداری ئاو لێبڕاوە، ڕەق و تەق، لەبرسان هیشک بوویتەوە، دووڵای کەیتەوە گردەبڕ دەشکێ، ئەسلەن پارەی پێ پیشاندەی سووژدەی بۆ دەبات، ئەگەر زانیبام قوڕەی زگی دێ لەبرسان؟! خۆم پێوە ماندوو نەدەکرد، مەسەلە بێگانە پەرستی یە، ئەگەرنا، ئەم زڕتە بۆزە، هێندە هیشک و برینگە، سەری ببڕە خوێنی لێنایەتجەنابیان چیتر خۆی بۆ ڕانەگیرا، لەقاقای پێکەنینی دا گوتی:

ـ ماڵ میرات، تۆ، بەخۆت و دەمانچەوە نیوە ڕۆحت کردووە، هەرچی پارەو پووڵ و شتی وێی بووە، دەستێکت بەبنی باخەڵی داهێناوە، ئێستاش دەتەوێ سەری ببڕی، ئەوە ویژدانی خۆت بێ، دەبێ ویژدانی ئەوەت چۆن بێ؟!

ـ بەڕێز، مەبەستم ئەوە نییە سەری ببڕین، مەبەستم ئەوەیە بەڵکو پێی بڵێی: ئەگەر جارێکی تر ڕێی بەم وڵاتەی ئێمەدا کەوتەوە، بەلانی کەم هەرهیچ نەبێ بای ماندوو بوونی کابرایەکی ڕێگر، پارەو پووڵ لەگەڵ خۆی هەڵبگرێ، جەنابیان، بەبیستنی ئەم پێشنیارەوە زۆر توڕەبوو، بەسەرمدا گوراندی!

دەزانی ئەم قسە قۆڕو پڕو پووچانەی تۆ، مانای گاڵتەکردنە بەدادگاو حکومەت و یاسا، دەم ڕووت، قەوچەت تێکنێ، ئەگەرنا، وا کابرای بیانی دیتی جەنابیان لێم توڕە بووە، خەریکە لێم توونە دەکات، هەستاوە سەرپێ، بەورتە ورت ڕووی لەقازی کرد، هیچی لێ حاڵی نەدەبووم، تەنیا ئەوە نەبێ، دەیگوت (نۆپڕۆبڵمنۆپڕۆبڵم) هێوری کردەوە پشتی هنگێ قەڵەمی بەدەستیەوە گرت، لەبەشی خوارەوەی پەروەندەکەم، یەک، دوو

ڕســـتەی نووسی و واژۆی کرد، نازانم چی نووسی، زۆر بەشێنەیی قسەی بۆ قازی دەکرد، قازی سەری بۆ ڕادەلەقاند، دواتر چاوم لێبوو، هەندەک پارەی پێداو بەدەست ئامازەی بۆ من کرد،

: بێگومان کابرای بیانی بەزەیی پێمدا هاتبۆوە، مسۆگەر ئەم پارەیە بـــۆ من بوو، کەچی زەقەی چاوم هات، حەپەلوشـــی کرد، دواتر کابرای بیانی دەســـتی قازی کووشی، ئەنجا بەزەدەخەنەوە هات، دەستی بۆ من درێژ کرد، دەســـتم دایە دەستی تەوقەمان کرد، جانتاکەی لەسەر مێزی نووســـیاری دادگابوو، هەڵیگرت کردیە شانی، بەسەر دوعابوونی خواست ڕۆیی،

بەڕێزیـــان گوتی: بەختت یاربوو، ئەم گەڕیدەیە بیانییە لەمافی خۆی خۆش بوو، خەرجی دادگاشـــی ژمارد، کەدەبووایە تـــۆ بیژمێری، بەڵام ئەگەرچی (ئەو) لێت خۆش بوو، وەلێ مافی گشـــتی هەرگیز لێت خۆش نابێت، چونکە ســـووکایەتیت بەحکومەت و هاونیشـــتیمانییانی خۆمان کردووە، بۆیە بەپێی یاســـای نیشـــتیمانی ژمارە ()بۆ ماوەی دوومانگ، بڕیاری حەپس کردن دەتگرێتەوە، ئەویش بۆتەمبێ کردنت،

: ئیدی پەلکێشـــیان کردم بۆ بەندیخانەی ناوەندی، دوو مانگم تیادا گوزەراند، بەڵام خوێنی خۆم خواردەوە

-١٠-

کەلەبەندیخانە دەرچووم، لەخەمی ئەوە دانەبووم پارەی چوارمانگ کرێـــی خانوو قەرزداری هەیبەت خانم، زیاتر لەخەمی ئەوەدابووم تازە ناســـرام، ئەم ناســـینەم بووە هۆکاری لەدەستدانی پیشەکەم، چونکە زەحمەتە هەتا پیشـــەیەکی تر دەست نیشان دەکەم و لەسەری ڕادێم، دوورەگایە، بۆیە سەری دنیاو بنی دنیام لێ وێک هاتبۆوە لەحەژمەتان، پیشەگۆڕین بە ئارەزووی خۆت پێ خۆشە، بەڵام کەلێت قەدەغەبکەن زۆر ئەســـتەمە، بۆیـــە تێمابـــووم، ئەگەر هوری هـــوری دەچمەوە بۆ مەیدانی کرێکاران؟! هەرهەمان مەیدان و وەستاو خزم خزمانێ و کلک بادانە، پارەوپوول شـــک نابەم لەبازاڕ مامڵەت و ســـەودای پێ بکەم، (شەڕبەشیر، مامڵەت بەدراو) دراو هیچ، دەستی لێ بشۆ، ئەو شیرەی کەمن لەڕێگریدا بەکارم دێنـــا، دەمانچەی گۆڕین بوو، ئەویش پۆلیس دەســـتی بەســـەرداگرت، ئیتر پاش دەرچوونم لەبەندیخانە، پۆلیس و

پاســـەوانی شـــەوان و بگرە منداڵ و خەڵکی شار پێیان زانیوە، کەمن دەمانچەی پلاستیکم بەکارهێناوە، ئەم سام و هەیبەتی هەمبوو نەما، خۆناشـــکرێ بەدەستی ڕووت دەســـت پێ بکەمەوە، چارەر ئەوەبوو بەدوای کارێکی دیکـــەدا بگەڕێم، کەبەدووربێت لەخەتەرناکی و زمانی خەڵک.

وابوو لەبازاڕی گەنم فرۆشان، نک مامەشینەی خەلەفرۆش بە (کەیار) گیرســـامەوە، بەڵام چۆن گیرسانەوەیەک؟! بەخۆڕاییلەخانەی گاڵتە و گەپ دەرچێتەدەرەوە، ســـوحبەت ناکەم، بەخۆڕایی لای مامەشینەی تەڕاح بەکەیار دامەزرام، لەدوکانی مامەشینەی خەلەفرۆش، ئیشوکاری من ئەوە بوو! هەنگین ڕێگاوبان لەنێوان گوندو شـــاردا وەکو ئیســـتێ نەبوو، ئۆتۆمبێل دەگمەن بوو، خەڵکی گوندنشـــین بەپشتی گوێدرێژو وڵاخی بەرزە بەرهەمی کشـــتوکاڵیان دەهێنایە شـــار، ئەو دانەوێڵەی جوتیارەکان دەیانهێنا بۆ دوکانی مامەشینەی تەڕاح، ئەوەی دەفرۆشرا، خەڵک دەیانکڕی، ئەوە لەگۆڕێ هەڵدەگیرا، مامەشـــینە پارەی دەڵاڵی و عاردانـــەو کەیارانەی لێ دەگێـــڕاوە، لەبەشـــەپارەی کەیارییەکەی من، کەهەقدەســـتی ماندووبوون و شـــان و پیلی مـــن بوو، هەندێکی لێ دەقاچاندەوە، دەیخســـتە تەنگـــەی باخەڵی، دواتر کاتێ کەنیوڕان لەکەلی دەکەوت بازاڕ کزدەبوو، ئەو دەغڵ و دانەی کەنەدەفرۆشرا لەو گۆڕەی دەماوە، خاوەنەکەی گێـــچ دەکەوتە کەولی، چونکە دەبووایە بـــۆ ئێوارە بگەڕێتەوە بۆ ماڵ لەلادێ، مامەشـــینە خۆی لێ دەهاوێتە سەرپشـــت، دواجار بەنرخێکی هەرزان، کەمتر لەنرخی بازاڕ بۆ خۆی هەڵیدەگرتەوە، مامە شـــینە، دوو (ڕبە) ی هەبوو، ڕبەی کڕین، ڕبەی فرۆتـــن، من کەیاربووم، گەنم و جۆو نیســـک و نۆکم دەور دەکردەوە، واتـــە پێوانەم دەکـــرد، دوای دەورکردنەوەی گەنمـــی کابرای فەلاح، بۆخودی مامەشـــینە، لەوەش پارەی دەڵاڵـــی و عاردانە و کەیارانەی لەکابـــرا دەگێڕاوە، لەپـــارە کەیارییەکەش هەندێکـــی لێ حەپەلووش

دەکرد، گوتم: دووڕیـــەی هەبوو، ڕیەی کڕین گەورە بوو، ڕیەی فرۆتن بچووک بوو (سەیرکەن، دزییەکی بەئاشکراو بەداکوباب)

: جارێکیان سەبارەت بەڕیەی گەورە وکچکە، لەمامەشینەم پرسی

- بۆچی ڕیەی گەورەو بچووک بەکاردێنیٚ؟! گوتی!

- کوڕم هۆشت بیٚ، بۆچی هێندە بیٚ مێشکی؟!

مـــن، کەبەڕیەی گەورە لێیان دەکڕم، مافی خۆمە، چونکە لەوانەیە ســـبەینیٚ قیمەتی دابیەزی، تۆبلێی، ئایا خودا هەڵدەگری، من لەپای چـــی زەرەربکەم؟! دووهەم شـــت، من کەلێیان دەکڕمەوە حیســـابی ئـــەوە ناکەی، دانەوێڵە لەکاتی پێوان و دەورکردنەوە بۆ جاری دووەم و ســـێیەم، بێگومان لەکورتی دەدات، بـــای دوو ئەوەندەش لەگۆڕیٚ خەسار دەبێت و میرووستان دەییات، ئەوە هەموو زەرەرە، ئەم زەرەرە لەقەبرغەی من دەکەویٚ، خۆمن خزمەتکاری باوکی فەلاح نیم، سێیەم شـــت فەلاح پارەی خۆی کاش وەردەگێرێت و لێدەدا دەڕوا، چ منەتی پێیـــە؟! ئەو پارەی من دەمریٚ، یـــان زەرەر دەکەم، زەرەریش تاڵە، کـــەس حەز بەزەرەر ناکات، چوارەم شـــت من کرێـــی دوکان دەدەم، پارەی باج دەدەم بەحکومەت، پارە شیرینە، ڕەگێکی لەجەرگی مرۆڤدا داکوتاوە، بائەوەشـــت پیٚ بڵێم، ئەوەی لەبازاڕ کاربکات؟! نابیٚ هێندە بەهوردەو لێکدانەوە بێت، ئەسڵەن ڕیەی گەورەو گچکە، لەدێرزەمانەوە بۆ ئێمەمان ماوەتەوە، تێگەیشتی.؟!

خۆ بەگوێی خۆتان گوێبیســـتی مامەشینە بوون؟! ئەی لەوەپێش نەمگـــوت: من و تۆ، خەزنەدار و پاشـــاو گەدا، هـــەر هەمووان دزین، ئەوەتانیٚ من، ڕۆژانە بەئاشـــکرا دزی بۆ مامەشـــینە دەکەم، جیاوازی نێـــوان ئەو دزیەی من کەبۆ خۆمم دەکرد، لەگەڵ ئەم دزییەی بۆ مامە شینەی دەکەم، ئەوەیە! مامەشینە دزێکی ئاقڵ مەندە، بەئاقڵانە دزی دەکات، وەلـــیٚ هەرچی من بووم، دزێکی سەرشـــێت و گەمژەو گێلانە بووم، کەسێک نییە پەنجەی دیاردیی بۆ ئەو درێژ بکات، کەچی پەنجە

لـــەدوڕ چاوی من ڕادەکەن، ئەوەی زمانی دەزاریدا بێ تفوو نەفرەت و تووک بۆ خانەوادەو ئاجەراتم حەواڵە دەکات.

بەلاتانەوە ســـەیر نەبێت ئەگەر بڵێم: خەڵکی سادەو ساکار (گای بەگونان دەناسن) چونکی مامەشینەی خەلەفرۆش، هەبووە و زەنگین و دەســـت ڕۆیە کەس لێی ناگرێ، لەڕیـــزی پیاوماقووڵ و پیاو چاکان هەژماری دەکەن، لەمەجلیســـی گەورە پیاوان و لەکاتی بۆنەو پرسە و سەرەخۆشیدا، بەفەرموو فەرموو بۆ هەوراز پێشوازی لێدەکەن، کەچی لەئاســـت بابایەکی برسی داماو وەکو من ئاسا، بەمەرجێک؟! مسۆگەر هەر هەموو دەزانن کەمن، لەپێناو بژێوی ژیاندا هاناوەبەر دزی دەبەم، ئەوجا لەجیاتی باروبوو، تف و نەعلەتم لێدەکەن، بەچاوی بوغزو قین ســـەیرم دەکەن، وادەزانن کەمن دیواری (کابـــە)م ڕووخاندووە، پێنج هەزار گوندم ســـەراوژێر کردووە، پێیانوایە کەمن نەگریســـم، بوومەتە باعیســـی ڕزقیان، ئەگەر لەدەســـتیان بێ؟! چ لەئیســـتێ زووتر نییە بەتەنەکەلێدان، بەدەستی منداڵە هورتکان شار بەدەرم دەکەن.

مامە شـــینەی تەڕاح، جگە لە ڕبـــەی گەورەو کچکە، هەموو جارێ لەکاتی پیوان و دەورکردنەوەی دانەوێڵەدا، بەچپە پێی دەگوتم:

( لەگەرمـــەی پیـــوان و دەورکردنەوەو (داریـــە)دا، ناوەناوە بدە دەمیئاودیوی کە، تێی چۆلێنە،)باشـــە، نانێ بەم شـــێوەیە بێتەسەر ســـفرەی خوان یانی چی؟! واتا من دزی لەفەلاح بکەم، نەک بۆ خۆم، بـــۆ مامە شـــینە، ئێوە چ ناوێکی لێدەنێـــن؟! تێفکریم، لەدڵی خۆمدا گووتم: من، بەخۆم بارم گەلێک سووکە، بەبارێکی گەلێک پیرۆز دەچمە حزور پەروەردگار، هەرئەوە مابوو باری مامەشینەش لەخۆم هەڵدەم، گوریس بەیەکلایی پیاناگا، دوولای کەیتەوە چۆن.؟؟))

دواجار ڕۆژێکیان لەلادێ، لەسەرجۆخینان چۆکم دابووە عەردی، بەرم لەڕەوسەی گەنم گرتبوو (یکوێکدوو،و، دووسێ وسێ، پێدادەچوومداریە یەکداریە دوو،) هیچم ئاودیو نەدەکرد، مامەشـــینە بەدیار ســـەرمەوە

ڕاوەستابوو، بەچپە دەیگۆت:

(حەسۆیانیحەسۆیانی)ئاودیوی کە، تێی چۆلێنە، من هەرگیز خۆم شـــێلونەدەکرد، لەســـەر دەورکردنەوەی خۆمهەژدەنۆزدەداریە پێنج، بەردەوام بووم، مامەشینە لەقاران چاوی چووبووە تۆقەرەی سەریدەهات و دەچـــوو ژانی هاتبووێ، نەدەحەجما، ئیتر پاش عەســـرێکی درەنگ دەســـتمان بەربوو، گەنم لەلۆری بارکرا، بەڕێکەوتینکەگەیشـــتینەوە مەنزل،مامەشینە بانگی کردم.گوتی:

هابگرە، ئەوە هەقدەســـتی ماندووبوونی ئەمڕۆت، بەڵام ئەوە پێت دەڵێم: نەکەی جارێکی تر ڕووبکەیتەوە ئەم دوکانە، قاچت دەبڕمەوە، بەدەســـتی خۆت خۆت نان برای کرد، بڕۆ لاچۆ لەبەرچاوم، نەگبەتی کوڕی نیگبەت، دەی لەخۆت هەڵدە.

: خۆبیستتان چونکە درزیم بۆی نەکرد،چۆن؟! بەپارەسووان وەدەری نام نان برای کردم،

-١١-

کەپێم لەدووکانی مامەشـــینەی تەڕاح بڕا، دیســـان کەرم لێ کەوتە قوڕێ، ســـبەینەکێ زوو تاریک و ڕوونی بەیانی، شـــلوخاو، بێ واز لەماڵ دەرکەوتـــم، قاوەلتیم نەکردبوو، لەلایەکی دیکەوە پێڵاوەکانم فلْتەفلْتیان بوو لەپێم، دیقەتم دایە ســـەر پەنجەکانی پێم، وەکو فەرخەپەڕەسێلکە، چۆن لەناو هێلانە ســـەریان دەردێنن، ئەودەمەی داکانەو بابانە دانیان بۆ دێنن، بێچوەکان دەکەونە ســـەرەقوتکێ و زیکەزیک و سیکەســـیکئەوها سەریان دەرێنابوو، هەرئەوەمابوو هاواربکەن، نەمزانی نەبەهانای زگمەوە بچـــم، یان بەهانـــای پەنجەکانمەوە، کەوتبوومە نێـــوان چاڵان و ماڵان، فکـــرم ئالۆزو پالۆز بـــوو، هەر بەڕێوە بیرم لێدەکردەوە، کاتێ هشـــیار بوومەوە ســـەرم بلْند کـــرد، لەپێش قاپی مەیخانەبـــووم، دیتم، یەکێک لەسەر کۆســـپەی دەرگای یانە لەسەرچاو لێ کەوتووە، یەک لات عاردی بەخـــۆی گرتووە، خەوی لـــێ کەوتووە، تومەزە ســـەر هێوارێ هێندەی

عارەقی ســـادەو قاچاخی عەنکاوەی خواردبۆوە، تەواو سەرخۆش ببوو، لەپەلوپۆی خستبوو، ئاگای لەخۆی بڕابوو، شەودرەنگ بووە، ڕێ بەدەری نەکردبوو بەمـــاڵ بکەوێتەوە، زەحمەتی نەدابـــووە بەرخۆی، هەر لەوێ سەری بەکۆسپەی دەرگای مەیخانە کردبوو، کپ خەوی لێکەوتبوو.

لێـــی چوومە پێش، نەختێک ڕامهەژاند، نەخێر، ئاگای لەخۆی نەبوو، ســـەرنجم لێگرت!جووتێک پێـــڵاوی تازەو نوێی لەپێدابوو، بەئەســـپایی پێڵاوەکانیـــم لەپێی داکەناند، لەپێی خۆم هەڵکێشـــا، پـــڕ بەپێم بوو، پێڵاوەکانی خۆم لەپێینگانی دانا، ڕۆیشـــتم، چووم لەچایخانە دانیشتم، داوای نان و قەیماغی گامێش و چایەم کرد، تمەزە کابرای ســـەرخۆش، دوابـــەدوای من کەمێک بەری دابوو، هەســـتابۆوە پێڵاوەکانی لەمەڕەمن، بەسەرپێی وەدەکات، لەکاتێکا من خەریکی نان و قەیماغ خواردن بووم، دیتم کابرای ســـەرخۆش بـــەلارە لارو ڕەوت بردن دەهات، هات شـــانی لەشـــانم گیرکرد دانیشت، جگەرەیەکی داگیرساند، نەختێک چاوی خۆی هەڵگلۆفت، کەچاوی هەڵهێنا چاوی بەپێڵاوەکانی خۆی کەوت و تەماشای پێڵاوی پێی کرد، پێڵاوەکانی خۆی ناسییەوە، گوتی.

- ئەم پێڵاوەت لەکێ بوو؟!

ئەم پێڵاوە هی منە.

:کەتێفکریم، نەخێر، تووشی گۆبەندم دەکاتپێمگوت:

- پێش نیوسەعات بەرلەئێستا بەپێش دەرگای مەیخانەدا ڕەت بووم، دیتم سەرخۆشێک شەڕواڵێکی ڕەشـــی لەبەردابوو، لەسەرچاو کەوتبوو، ئـــاگای لەخۆی نەبوو، منیش شـــەڕواڵەکەیم لەهینـــی داماڵی، تیلکەکم پێوەکـــرد، جوولەی نەکرد، ئەم جووتە پێڵاوەشـــی کردبـــووە بالیفۆکە ســـەری پێکردبوو، پێڵاوەکانیم لەبن ســـەری دەرێنا، پێم تێ هەڵکێشا، پێڵاوەکانی خۆم بۆی بەجێ هێشت، کەوامگوت: کابرای سەرخۆش دەمی بـــووە تەڵـــەی تەقیو، متەقی نەکرد، ئیتر نەمـــن دەنگ و نەئەو دەنگ، بەردەکی خستە بانی.

-١٢-

ژیان و گوزەران لەناو گەڕەلاوژەی شاراندا زۆر بەزەحمەتە، ئەوکەس مەردە بشێ بژێوی ڕۆژانەی خاوخێزانی پەیدابکات، نەک شەوان بەبرسێتی ســەربنێتەوە، لەبەر قۆڕە قۆڕی زگی خەونەچێتــە چاوی ( (باب مردی خەوی لێدەکەوێ، زگ برسی خەوی لێناکەوێ))

وابوو ئێوارەکیــان تاریک کەوتبووە عاردی، زۆر بەســستی بەرەوماڵ دەبوومەوە، لەزارکی کۆڵانێ گەڕەکی خۆمان ســواڵکەرێک هەبوو، چووپی تایەی تورەمبێلی لەپاشــەڵ و ناوگەڵی خۆی هەڵدەکێشــا، لەسەر قوون دەخشی دەرۆزەی دەکرد، من بەخۆم زۆر بەزەییم پێدا دەهاتەوە، ناوە ناو کەوتبایە بەرچاوم نائومێدم نەدەکرد، کەچی ئەم ئێوارەیە کەلەزارکی کۆڵان کەوتە پێش چاوم، چاوم لێبوو ســەیری ئەملاو ئەولای کرد، منی نەدیت، منیــش لێی بەگومان کەوتــم، خۆمدایە پەنا دیوار، وابــێ نەمبینێ، ئیتر کەدڵنیابوو کەس چاوی لێ نییە، هەستاوە سەرپێ بەتەڕ دەستی چووپەکەی لەقینگی داماڵی و تێی تەقاند خۆی لەحەوشەی خۆیان کوتاوە.

: لەدڵی خۆمدا گوتم: دەردت لەگیانم هەتا ئەمشەو ڕۆژم لێ دەبێتەوە چارت دەکەم.

سـبەینەی ڕۆژی ئایندەدەمە دەمی چێشـتەنگاو، لەم کۆڵان بۆ ئەو کۆڵان، لەم شـەقام بۆ ئەو شـەقام، دواجارلە پێـش دەرگای مزگەوتی گەورە لەناو بازاڕ دیتمەوە، چووم شـانم لەشـانی گیرکرد دانیشتم لێم پرسی

ـ چۆنی براله؟!

ـ وادەمبینی لەچ حاڵدامە.

ــ بەڵـێ، دوێنێ ئێوارەش تـۆم بینی لەچ حاڵ دابـووی، ڕەنگ و ڕوخساری تێکچوو، زەرد هەڵگەڕا، دەنگی نەکرد،

ـ هاٰ بزانم بێ دەنگ بووی.؟! گوتی:

ــ خودا لێت هەڵناگرێ، گێچەڵم پـێ مەکە، خاوەنی کۆزێک زارۆی سەرکەو بنکەم،

ـ من گێچەڵت پێ ناکەم، بەڵام تۆ نازانی من پۆلیسی نهێنیم، دەبێ ئەم ڕاستییە بەبنکەی پۆلیس ڕابگەیەنم، تاوەکو بێن دەستگیرت بکەن، چونکە تۆهیچ بەڵات لێ نییە، بەساختەچیەتی وات لەخۆت کردووە، ئەوە پێشێلکردنی یاسایە، دەبێ سزابدرێی.

ئیدی زۆر پاڕاوە وازی لێ بێنم، پێمگوت:

سەری خۆت لەبەرد مەدە، بێ هوودەیە، چارنییە هەردەبێ ڕادەستی پۆلیست بکەم، دوای تاوێ بێدەنگێ پێمگوت:

ـ بەمەرجێک وازت لێ دێنم.!

ـ فەرموو بڵێ، مەرجی وەکو چی.؟!

ـ بەم مەرجەی ڕۆژی چەندت دەسـتدەکەوێ، نیوەی بۆ من، نیوەی بۆ خۆت، دەڵێی چی؟! گوتی:

ـ ویژدانت بێ، چۆن ویژدانت ئاسـوودە دەبـێ؟! من لەدەمەدەمی خۆرهەڵاتنەوە تاوەکو درەنگانی شەو، لەسەر قوون بخشم، کەچی نیوەی بۆتۆ بێت.!ئەوە زوڵمە.!

- ئەوە مامەڵەیە، هیچ پەیوەندی بەزوڵم و ویژدانەوە نییە،
-ئەگەرنا، فەرموو پێشم کەوە بۆ بنکەی پۆلیس.! گوتی:
- باشە، بەڵام تۆ پێوە ماندوو و شەقی نابی، دێیتە سەر حازرەکی، لەچواریەش بەشێکی خۆت وەرگرە، نەمن دەنگ و نەتۆ دەنگ.!
ئیتر بووینە شەریک و برابەش.
سێ چوارمانگ بوو لەسایەی سـەری دەرۆزەکەری قوون بە چووپ، وەکـو ئاغاو فـەلاح! کەدەغڵ و دان دەهێنێتە بەرهـەم، ئاغا بەکارەخۆ، لەسـەر ڕەوسـەی گەنم ئامادە دەبوو، لەبیسـت عەربە، چوار عەربەی لێ هەڵدەگرت، منیش درەنگی هێواران سـەرەکۆلانم لەسواڵکەر دەگرت، چواریەکی خۆم لێوەردەگرت، پاشـان هێدی هێدی کێلدەبوومەوە بۆلای ڕەحمەخانی هاوسـەرم، شەوان لەتەک ڕەحمەخان کڵاوم لێ خواردەکرد، تادرەنگانی شەو، دواتر بێ خەم و خەیاڵ لەباوەشی ڕەحمەخان دا، وەکو بەرخی تێرشیر پرخەم دەهات، دنیا ئاوبرد بای، ئاگری گرتبایە، کرۆکۆی دامرکابووایە، یان زەوی سەراوبن بووایە، خۆم لەگوورە نەدەبرد
(پیشەی سواڵکەری، پیشـەیەکی پڕلەخێرو بەرەکەت و ئاسانیشە، هەرنەوەنـدەی زەحمەتـە، تاکو مرۆ دەسـتی لـێ گیردەبێت، پارووی دەکەوێتە ڕوونی، بەتەخت و تاجی شاهانە نایگۆڕێتەوە،)
ئەو دەرۆزەکەرەی کەمن و ئەوببووین بەدۆست و هاوبەش، بەگۆتەی خۆی یەک لەچواری دەسـتکەوتی ڕۆژانەی سـواڵکەریەکەی بۆمن وەلا دەنێـت، بێگومان درۆی دەکرد، ناپاک بوو، خائین بوو دزی لێم دەکرد، لـەم لاوە هەندێکی لێ دەقاچاندەوە، لەڕۆژی بازاری قیامەت دا، لەحزور پەروەردگار بەرۆکی دەگرم، مافی خۆمە هەرگیز لێی خۆش نابم، چونکی ئەم قورمساخە، دەیگۆت:
(کاری ئێمەش بەسـتراوەتەوە بەبازاڕ، ئەگـەر ئەهلی بازاڕ، بازاڕی کاڵاو شـتومەکیان گەرم وگوڕ بەڕەواج و هەرمێـن بوو، بازاڕی ئێمەش گەرم دەبێت، ئەگەرنا، بەپێچەوانە بازاڕ کزدەبێ، دەسـتکەوتی ئێمەش، چینی سواڵکەرانی وڵات لەکورتی دەدات،)

ئەوجا هێشـــتانەکێ، لەگەڵ ئەم فرت و فێڵ و کەڵەکەبازی و کۆسە کۆسانی و سێبەندیەتی ئەم قورمساخە لێی دەکردم، من، بەم چواریەکە تەپڵی شاهانەم لێدەدا، بەڵام لەناکاو نازانم ئەو نامەردە، عارد قووتی دا، عاسمان هەڵیکێشا، جنۆکە سوورگومیان کرد، چی بەسەرهات ؟! نازانم، ئەو بێ ڕەوشـــتە لەپەلوپۆی خستم، دیسان شـــیرازەی ژیانم لەباریەک هەڵوەشاوە، کەوتمەوە سەرساجی عەلی.

-١٣-

بەرداشی ڕۆژگار لەدەوران دەورانی خۆیدا ناکەوێ، منیش بەژیانی دۆمانە ڕاهاتبـــووم، نانی ئێوارەم مســـۆگەر بایە، قەت لەخەمـــی ژەمەنانی بەیانی دانەبووم، هیچ پاشـــەکەوت و دەســـتمایەم نەبوو بۆ ڕۆژانی تەنگانە، وابێ چنگە چرەیەکی لەگەڵدابکەم، بۆ ئەوەی حەوجەی دەســـتی پیاوی نامەرد نەبم، چونکە لەژیاندا لەهەموو ناخۆشـــیەکان ناخۆشتر ئەوەیە! مرۆ دەست لەبەر پیاوی ناکەس بەچەو بەرچاوتەنگ پان بکاتەوە، شـــەرمە، ئەســـڵەن مـــردە نییە بۆ مـــرۆڤ، بۆیە من هانا وەبەر دزی و ڕێگـــری دەبەم، نەبادا ڕۆژێ لەڕۆژان گەندەیەکی ناپاک جەســـارەت بکا، خۆی لەسەرم هەڵکێشێت و زمـــان ڕەپی بکات بڵێ: دووعانـــەم قەرداریحەددی چییە؟! زمانی دەبڕم، مرۆ لەڕووی ئەوکەســـانەی کەدیلی پارەو پوولن، بەزەبری پارە لێدەخوڕن، هـــەردەم تفەنگی لەســـەرپێ بێت، هەرگیز دەرفەتیان پـــێ نەدات زمانیان بگەڕێ، ئەم پوولەکییانە هەندێکیان خاوەنی دوو(هیزە)ن، هەیە سێ هیزەی لەبن دەستی دایە، هی واشیان هەیە خودانی چوار هیزەیە، ئەوجا دەچن دۆنی خۆیان لەهیزەی کەسانێکی دیکەدا بەتاڵ دەکەن، خەڵکی دیکەش

هەن دەچـــن دۆنی خۆیان لەهیزەی ئەواندا بەتـــاڵ دەکەن، تۆ بڕۆ لێی بپرسە، پێی بڵێ: تۆ کەلەدەرەقەتی یەک هیزە نایەی، چۆن پێدەوەستی چوار هیزەی تژی دۆن بکەیت و؟!مۆزە مۆزو مرومۆ، یان بەدوای هیزەی کەســـانی دیکەدا بگەڕێی دۆنی خۆتی تێبکەی، بەمەرجێک؟! هیزەکانی لەمەڕەخـــۆت لەبـــێ دۆنی وەکو چەرمە چەقاڵتە هیشـــک و ڕەق و تەق بوونەتەوە، تەڕایەتیان تێدانەماوە، ئەسڵەن تەریفە بوونە لەتێنان، ئەگەر ڕەباس نەکرێتەوە؟! لەکاردەکەون، چیتر زاوزێ ناکەن.

دوای ئەوەی ئەو هەتیوە ســـواڵکەرە قوون بەچووپە وەکو (لەمەچێر) شـــوون بزر بوو، نان بڕای کردم، تێمابووم، هەرچەندی ســـەرم دەهێناو دەبرد، نەخێر کارێک نەبوو دەســـتی پێوەبگرم، بۆیە دیسان کەوتمەوە ژێربـــاری قەرزو مانگانـــەی کرێی خانووی هەیبەت خانباکەمێک باســـی هەیبـــەت خـــان بکەم! ئەو خانمە بێوەژنەکی ســـوورو ســـپی، قژزەرد، چاوشـــین، باڵابـــەرز، نەزۆرباریـــک نەگۆشـــتن، ئەگەرچی بەناوســـاڵدا کەوتبـــوو، بەڵام ئەوە کەفەڵی بوو، چونکە زاوزێی نەکردبوو، نەقەپابوو، بتەوبوو، بەگۆتـــەی خۆی گوایە ڕەحمەتی هاوســـەری لەدڵی نەهاتووە ژنی بەســـەربێنێ، ئۆجاغ کۆربوو، جگەلەم خانـــووەی ئێمەو ئەو تیایدا ئاکنجی بووین، حەوشەو خانووبەرەیەکی دیکەشی لەگەڕەکی (جوولەکان) بەمیرات بۆی بەجێ هێڵابوو دابوویە کرێ، فرەدەوڵەمەند بوو، تەنیا باڵ بوو ئەگینا لەهیچی کەم نەبوو.

ئەوەی ڕاســـتی بێ دەمێک بوو مرخی خـــۆم لەهەیبەت خان خۆش کردبوو، بەڵام جەســـارەتم نەدەکـــرد خۆم لەقەرەی بـــدەم، ئەگەرچی دەمێکیش بوو، لەدیدو ڕوانینی هەیبەت خان بەگومان کەوتبووم، کەچی هەر دەترسام، چونکە جاری وابووە پیاو!

زەردەخەنەو چاوی ئافـــرەت بەهەڵە دەی خوێنێتەوە، بۆیە خۆم لێ دەپاراســـت، نەکا لێم تووڕەبێت، لەڕک ڕابچێ، تووشـــی گۆبەندم بکات، شڕو شیتاڵم تێهەڵداتە کۆڵان.

وابوو ڕەحمەخانی هاوسەرم لەسەر مانگ و ڕۆژی خۆی بوو، بۆیە وای

پێ باشبوو، بچێتەوە ماڵی دایکی، لەوێ زگەکەی دانێت، بەبیانووی ئەوەی لێرە کەسـێک نییە خزمەتی بکات، هەتـا ئەو ڕۆژەی بەخۆدەکەوێتەوە، منیش نەبوومە ڕێگر، پێمگوت:بەئارەزووی خۆت بکە، ئەوە ئیشی ژنانە، خۆت چۆنت پێباشـە، وابکەوابوو پرپاسکەی پێچاوە، بردمەوە بۆ ماڵی دایکی، چەند ڕۆژێک دوای چوونەوەی ڕەحمەخان بۆماڵی دایکی، ڕۆژێکیان دەمەدەمی نیوەڕۆ، هێواش هێواش بەرەو ماڵ بوومەوە، چوومە حەوشەو دەرگای هـۆدەی خۆمان کردەوە، دنیا گەرم بوو خۆم تەنیا کرد، تابڵێی بێوازو مەلوول، لەسـەر تریقەی پشـت لێ ڕاکشـام، چاوم بڕیبووە بن میچی ژوورەکەمان، سەری خانووەکە بەشێوەی (چاتی) بەشێڵمان وگەچ وکەرپووچ و قسـر سـەری گیرابوو، بیرم لەوەکردەوە ئاخۆ کێ هونەری داهێنانی چاتی بوو.؟! من، لەم خەیاڵانەدا بووم، هاکادیتم هەیبەت خان، لێم وەژوورکەوت، گوتی.؟!

ـ وێدەچێ نەساغ بی، والەسەرپشت ڕاکشاوی.؟!

: هەرلەجێوە نیوەڕاسـت بوومەوە، نازانم چۆن بەسـەر زمانم داهات گوتم،

ـ ئەژنۆم شلە، لەوانەیە ناوکم کەوت بێت، گوتی:

(کابزانم درێژبە و چۆکت بنووشـتێنەوە.) لەسەر پشت ڕاکشامەوە، ئەژنۆم نووشـتاندەوە، پێڵووم داداوە، هەستم لەخۆم بڕی، هەیبەت خان لەسەر چنچک هەڵقونجا، بەئەسپایی دەستی لەناوکم وەردەدا، دڵم کەوتە خلێلە و لێدان، نەخێر، بەهێواشـی دەستم بۆ ژێرەوەی برد، بەئەسپایی دەسـتم گەیاندە ماخۆمردەکەی، بەئاستەم خۆی جووڵاند، بەڵام بەسەرە خـۆی نەهێنا،گوتی (ئەوەتانێ ناوکت بەلای ڕاسـتدا کەوتووە،) بەفێڵی خۆ جوڵاندن، دیسان دەستم گەیاندەوە دوابڕاوەکەی، پڕ بەنێولەپم بوو، گوتی:

ـ وادیارە دەبزێوی، نیازی خراپەت هەیە،ها.؟!

خۆم لەگێلی دا، گوتم:

ـ ئەرێ گوتت بەدام لادا کەوتووە.؟!

:لەگەڵ دەســـت لێدان و هەڵاوەی گەرمـــی مامزۆکەی! حەیتەکەچەڵ وەکو (مار) ســـەری قیت کردەوە، ڕەشـــماڵۆکەی هەڵدا، شەپازللەیەکی تێسرەواند، گوتی (لەمەبپرسە، بەکام لادا کەوتووە؟)

: کارلەکارترازا، پاڵێکم بەســـنگیەوەنا، بەسەر پشتدا وەرمگێڕا، لێی هەســـتامەوە ســـەرچۆک، هەربەخۆم هینەکەیم لەلنگـــی داماڵی، خزێمە ناولنگانـــی، هێنـــدە تامەزرۆبوو، چاوی هاوێتبووە ســـەریەکدی، لەگەڵ نیخەنیخ کەوتبووە حاڵەتی نەستی، لەبەرەخۆی دەیگوت (پەحپەحپەح) ئەوخانمە ئەگەرچی بەتەمەندا کەوتبوو، بەڵام گشت ئەندامی لەشی وەکو پەنیـــری تەڕوتازەی کۆچەرییەکانـــی زۆزان وابوو، هێندە بەتام و لەزەت وچێژداربوو، مەپرسە؟!

لێتان ناشارمەوە لەو ڕۆژەبەدواوە پارووم کەوتە ڕۆنی، خێروبەرەکەت بەســـەرم داباریجارێ لەلای وێروە مانگانەی کرێی خانووم لەســـەر ڕەش بۆوە، ناوەناو دەســـتی هاریکاری و یارمەتـــی بۆم درێژدەکرد، بارویووی دەکـــردم بۆخەرجی ماڵ، هەرکاتێک دیتبای! پۆشـــاک وپێڵاوم نیوداش وکۆن بووە، هەندێک پارەی لەگیرفانم دەنا، دەیگوت (خۆت پێ پۆشتە بکەوە)ناوە ناوە کەکوتاڵ فرۆشـــی گەڕۆک کەدەهات بۆ گەرەک و کۆڵانی ئیمە، کوتاڵی بۆخۆی و ڕەحمەخانی هاوسەریشـــم دەکڕیئالەبیرم نەبوو، پـــەروەردگار بەزگەکی دووبەچکەی جوانی پێمان بەخشـــی بوو،کوڕێک وکچێک، ناومان لێنابوون (ســـۆرەو بـــۆرە)، هەیبەت خان زۆر بەبەزەیی ومیهرەبـــان بوو، هەرگیز درێخی نەدەکرد، دەســـت کراوە بوو، بەهەموو شێوەیەک باروبووی دەکرین، بێ بوغزو زۆر نەرم ونیان بوو،

لەمەوە، ڕەحمەخانی هاوسەرم لەهەردووکمان بەگومان کەوتبوو، دڵی کرمی تێکەوتبوو، بۆیە هەیبەت خانی دابووە بەرجۆتکان، لەمنیش لالوت بوو، لەڕاستیدا ناهەقی نەبوو، چونکە قسەی خۆمان بێ، پیاوی مخەننەت زۆرن، بێگومان من، هەرلەسەرەتادا لەو ڕۆژە دەترسام، ڕیسم لێ ببێتەوە بەپەتە، چونکی لەختوخـــۆڕا نەیانگوتووە! (مانگا بەدزی کەڵ دەخوات، بەئاشـــکرا دەزێ) ڕەحمەخان دڵنیابوو کە دەســـتم لەگەڵ هەیبەت خان

تێکـــەڵ کردووە، بەڵام ڕاســـت و ڕەوان نەیدەدرکانـــد بەڕوومدا هەڵێنێ، گەرەکی بوو بەچاوی خۆی بمانبینێ، وابێ زمانمان نەگەڕێ، من، تێگەیی بووم، وەلی دەســـت خەڵەتم دەدا، ســـەرەمانگان پـــارەی کرێی خانووم دەدایە دەست ڕەحمەخان، دەمگوت (بیدە دەست هەیبەت خان)پارەکەی دەدابـــە هەیبەت خـــان، دواتر بـــەدزی پارەکەی بـــۆم ڕەت دەکردەوە، بەمەلێـــی تێچۆلابوو، زمانی دەبەســـترا کەچی هەربەگومـــان بوو، وەکو پشـــیلە ومشکمان لێ هاتبوو، هەرچی من بووم چاوەچاوبووم ڕەحمەخان مـــژوول بێت، وەبی خۆم تێبکـــەم بچم دڵی هەیبەت خـــان ڕازی بکەم، هەرچی ڕەحمەخانیش بوو وەکو پشـــیلە خۆی دانووســـاندبوو، هەرکاتێ ســـەردەرێنم پشتی ملم بگرێ، من قەت خۆم شێلو نەدەکرد، بەسەرەخۆم نەدەهێنـــا، هەندێ جار کـــە ڕەحمەخان دەچووە سەرشـــۆرک، خەریکی خۆشوشتن دەبوو، من، کاری خۆم و هەیبەت خانم بەجێ دەگەیاند، فرت و فێڵی وام دەکرد، ســـەری لێ دەشـــێوا، لەگەڵ ئەوەشدا دەیزانی کاکەو برالەیەک لەئارادایە، بەڵام هیچ بەڵگەی دروســـتی بەدەســـتیەوە نەبوو، چونکە ئەگەر! ( دزو خاوەن ماڵ یەکبوون، گا، لەکولانکە ئاودیو دەکەن) ئەوجا خوای دەکرد (نۆبەدار) خێواوکی لەچاوی خۆی دەکرد، فرت و فێڵ زۆرە، کلیلی دەرگای حەوشەم لەهەیبەت خان وەرگرتبوو، ناوە ناوە دوای نوێژی شێوان، بەبیانووی چایخانەو سەردانی برادەران دەچوومە دەرەوە، تادەمەدەمی ماڵ نووستنان، درەنگ تریش ئەوجا دەچوومەوە، بەئەسپایی دەرگای حەوشـــەم دەکردەوە، خۆم فجوڕی ژووری هەیبەت خان دەکرد، چراکەمان وەک چـــرای دزان زۆرکز دەکرد، بەبێ دەنگی ئاوێزانی یەکدی دەبووین، پشـــتی هنگێ بەهێواشـــی دەچوومەوە دەرێ، دەرگاکەم کلیل دەداوە، ئێجا تەقتەق لەدەرگام دەدا، جاری وابوو ڕەحمەخان بەئاگا بوو، دەهات دەرگاکەی دەکـــردەوە، هەندێ جاریش خەوی لێدەکەوت هەیبەت خان دەچوو بانگی دەکرد، پێی دەگوت:

(هەســـتە کیژم دەرگا لەم پیاوە بکەوە)ڕەحمەخان سەرە دەری لەم بەزم و ڕەزمە دەرنەدەکرد، نەیدەزانی چباس و خواسە؟!

ئــەم تێکەو لێکەیە زەمەنێکی زۆری خایانــد، دواتر بیرم لێکردەوە، نەخێر، ئەم تێڕو دزۆیە بێگومان تاســەر ســەرناگرێ، لەلایەکی دیکەوە بەهیچ شــێوەیەک دەســتم لەهەیبەت خــان بەرنەدەبــوو، نەمدەتوانی دەستبەداری بم، ڕۆژێکیان بەهەیبەت خانم گوت:

ـ دەڵێی چی؟! بالەســەر دەستووری خوداو پێغەمبەر، ناوی خودای لێ بێنین، هی بن بەڕێ بێتە سەر بەڕێ، بامارەت بکەم.

ـ من پێم خۆشە، بەڵام ئەی ڕەحمەخان چۆن.؟!

ـ قەیدی چییە؟! خۆ ژن ژنی نەخواردووە، ئەوەی ڕاســتی بێ، من ناتوانم دەستبەرداری تۆبم، چونکە لەدەروونەوە پڕبەدڵ خۆشم دەوێی. گوتی:

ـ ئەگەر بشــێی ڕەحمەخان ڕازی بکەی؟! منیش خۆشــحاڵ دەبم، پێداچــوو گوتی: من لەزمانـــی ئافرەت دەگەم بێگومان لــەم بارەیەوە پێگیری دەکات، ناخۆشــترین شت بەلای ئافرەت مەسەلەی هەوێدارییە، بەڵام هەرێی پێبدە بڵێ: زێڕو زیو، خشلی گرانبەها هەرچیت دەوێ بۆت دەکڕم، چونکە ئافرەت شەیداو مردووی زێڕە، تەماحی زێڕی پێبدە زمانی دەبەسترێ، دڵنیام نەرم دەبێت.

لەم بارەیەوە زۆر بەبەریداکەوتم، نەخێر، بەردی هەڵدەدا بۆ ئاســمان سەری خۆی دەدابەرێ، دەیگوت: (بڵێ: بمرە،، دەمرم، بەڵام بۆئەوەیان، نەخێر،)

: ئیدی لەســەر گفتی هەیبەت خان، بۆم تێکووشـــی، هەندە، هەندە ئاڵتوونت بــۆ دەکڕم، هەرچی تۆ دەخوازی ئامــادەم بۆت دابین بکەم، ســەرم لەبن سەری نا، چەنەم لەسەر هەڵنەگرت، هەتا سەلماندی، پارە پارەی هەیبەت خان بوو، من خەنجەر لەکابووم.

(ئەوەی مایەی سەرســوڕمان و نیگەرانییە، ئــەم جۆرە ئەقڵەتیە، ئەقڵیەتی ئافرەت بەرامبەر بەزێڕ، ئامادەیە لەبەرامبەر هەندێک خشــڵ و زێڕ دەستبەرداری ماف و بەرژەوەندییەکانی خۆی بێتبەڵام من والەئافرەت گەیشــتووم کەئافــرەت لەبەرامبەر کارەســات لێقەومانــدا زۆر بەهێزو

خۆڕاگره، بۆســـەلماندن! باسی ئازایەتی شێرەژنێک دەکەم کەلە مێژووی هیچ میللەتێکدا هاوتای نییەلەپێدەشتی کۆیە، پێشمەرگەیەکی لەشکری هێزی پێشمەرگەی کوردستان، لەشەڕێکی دەستەو یەخەدا، لەسەنگەری بەرگری کردن لە گەل و خاکی نیشتیمان، بەچاوساغی جاش و بەگوللەی ســـەربازانی ئێراقی شـــەهید دەکرێ، تەرمی پیرۆزی لەگۆڕەپانی شەڕدا بەجێ دەمێنێ، کەشـــەو دادێ هێزی پێشمەرگە پاشەکشە دەکەن، بەڵام جاش و جەیش ئەم ناوە چۆڵ ناکەن، سێ ڕۆژان دەمێنێنەوە، هاوسەری پێشمەرگەی شەهید، کەدەزانێ سەردارەکەی شەهید کراوە، هەربەم شەوە سەرپشتی لێ دەبەســـتێ، خۆی دەگەیەنێتە تەرمی پیرۆزی شەهید، بۆ ئەوەی نەکا تەرمەکەی بکەوێتە بن دەستی جاش و جەیش، لەسەرلبادێک درێژی دەکات، جـــوان لوولی دەدات، بەگوریس دەی پێچێتەوە، هەربەم شەوە، بەهەرحاڵی هەبووە دەیبا لەکونە شاخ دایدەنێ، گوتیان: دووشەو و دووڕۆژ بەتاقـــی تەنیا بەدیارییەوە دادەنیشـــێت، هەتا جەیش و جاش گەڕابوونەوە، دواتر هێنابوویانەوە بۆ ئاوایی بەخاکیان سپاردبوو.)

: بۆیە ســـەیرم پێ دێ، کەدەبینم ئافرەتی واهەن، لەئاســـتی زێڕدا، هێنـــدە بـــێ ورەو بەجارەکی دادەڕمێن، نان و ئاویـــان لێ ببڕە، تەقەی سەریان دێ، کەچی پارچە زێڕەکیان پێ ببەخشە، بەم پارچە زێڕە لەدڵ و دەروونەوە خۆیان بەخاتوونی دنیا دەزانن،

-١٤-

بەپارەو پوولی هەیبەت خان، لەبازاڕی ئاسنگەراندا دوکانێکم بەکرێ گرت،: قەڕاسەلغاوڕێشمەســـەرکەلە سندمزەنگوڵەدرێشەسووژنداسقەران گقەیناغشەنەی دارو ئاسنهەسانلاپوتەپیشـــەقاندەولککندڕتێڕڕاویەی ئاو کێشانکۆڵسکەزنجیرجەودێمکەمەتارەخاکەناسپێمەڕەداسووکەتەوشـــی و هوردەواڵەم تیادا دەفرۆشتبەڵام چونکی ئارەقەم پێوە نەکردبوو، بەپای پیلان چینەم لێدەکرد، بۆیە قازانج سەری مایەی دەخوارد، کاتێک بەئاگا هاتـــم وا خەریکە دەســـتم لەبنی هەنبانەدا دەمێنـــێ، کەوتمە ژێر باری خەمان، چیم لەخۆم کرد، بەچی وەڵامی هەیبەت خان بدەمەوە؟!

هەرگۆڕانکاریەک کەلە دنیادا ڕوودەدات، بێگومان هەندێک تیدا خەنی دەبن، هەندێکیش گەنی دەبن، ســـاڵ، هاوچەشـــنی شـــەو ڕۆژە، دێت و دەڕوا، ئاگـــری جەنگـــی نێوان ئێراق و ئێران هەڵگیرســـا، لەو ماوەیەدا ئاشنایەتیم لەگەڵ مرۆیەک پەیداکردبوو دەستێکی (گۆج) بوو، بەسەلیمە گۆج ناسرابوو، گۆجە لەسەر حەوت کندڕ یاری دەکرد، ڕێوی بوو، فێڵی

لەشەیتان دەکرد، دەستخەڕۆی دەدا، هەتلەی چەقینی دەکرد، ڕۆژێکیان دووقۆڵی لەدووکان دانیشتبووین، بەدەم مڵچە مڵچی چای دیشلەمەوە و هەڵمژینی دووکەڵی جگەرەگوتی:

ـ حەزدەکەی خێر دەستت بگریٚ؟!

ـ ئـــەی بۆچی نا؟ کەس دەســـتی کەرەمی گێڕاوەتـــەوە، تاکو من بیگێڕمەوە،

:جگەرەیەکی دیکەی داگیرســـاندو دوو سیٚ مژی لێدا، دووکەڵ لەدەم وکونە تفنگی دا سەری کرد، زۆرکەس هەن بۆ زمان کردنەوە بەر لە ئاخافتن جگەرە دادەگیرسێنیٚ زمانی دەکرێتەوە، دواتر سەلیمە گۆج گوتی:

قۆنتەراتـــی چێشـــتخانەی نەخۆشـــخانەو بەندیخانەی شـــارم لەکار بەدەســـتانی حکومەت گرتووە، بەڵام بەتەنیا بەمن ناسووڕیٚ زەحمەتە، بۆیـــە حەزدەکەم ئەگەر ئارەزوو بکەی بۆ ماوەی ســـاڵێک بەهاوبەشـــی پێکەوە پێوەی دەخولێینەوە، دڵنیام خێر دەســـتمان دەگرێت، جانازانم تۆ دەڵێی چی؟! بیٚ چەندو چوون گوتم: زۆرچاکە پەنا بەخوا

ئیدی دەستبەکاربووین، ڕۆژانە لیستی ژمارەی نەخۆشەکانی نەخۆشخانە و لیســـتی ژمارەی بەندییەکانی بەندیخانەمان لەژمێریارەکانی پەیوەندار وەردەگرت، بەگوێرەی هەردوو لیســـت: نانهێلکەگۆشتمێوەنیسکماســـت وکەرســـتەی چێشـــت لێنانمان لەبازاڕ دەکڕی، یەکێک لەو کەرســـتانە کەدەبووایە ڕۆژانە بیکڕین دۆشـــاوی تەماتەبوو، زۆربەگران لەســـەرمان دەوەســـتا، ڕۆژێکیان گۆجە گوتی (ئەگەر کار ئەوها بڕوا، قازانج سەری مایـــەی دەخوات، بەڵام تۆ هەر هێندەم ئارام لەســـەر بگرە، هەتا تامی زاری کارمەندەکان دەکەم، هەرئەوەندەم بەلاوە زەحمەتە هەتا دەســـتم دەیانگاتیٚ، ڤێجا بەچاوی خۆت دەبینی چۆن؟! دەستەمۆیان دەکەم)

گۆجەی سەروەســـتاو هاوبەشـــم، زمانێکی هەبوو دووپشکی دەڤەری دیاربەکری کەوی دەکرد، گۆجە هێدی هێدی دەستی بەپشتی کارمەندانی بەرپـــرس لەهەردوو چێشـــتخانەی نەخۆشـــخانە و بەندیخانەدا دەهێنا، نازانم دووعای بەســـەریاندا دەخوێند، یان جـــادووی لێکردبوون، زمانی

هەمووانی بەســـتابوو، بۆ دەســـتخەڕۆدانی لیژنەی چاودێری و پشکنین لەســـەر خواردەمەنی هەردوو چێشتخانەکە، دووکارتۆن پڕاوپڕ لەقوتووە دۆشاوی تەماتەی توسانی ســـەرمۆری تورکی و لەگەڵ ژمارەیەک قۆدی بەتاڵی لەســـەر تاخچەی چێشـــتخانەکان ڕیزکردبـــوو، کەچی لەجیاتی دۆشـــاوی تەماتە (سڵقەسۆر) مان هورد دەکرد، پاشـــان دەیانکوڵاند، ئەوجا ترپاتەکەیان لێدەگرت، ســـۆراوەکەیان دەکردە ناوچێشـــتی شلە، لەگەڵ باینجان بووایە، پەتاتەو پیاز، لەگەڵ هەندێک پیل و پەراســـووی پیرە (بزن)یان دەکردە چاوی تێکیان هەڵدەشـــێلا، تۆبڵێی! چێشـــت چ چێشـــت؟! وەکو چێشتی مجێور، تام ئاوی ســـاردی لێدەهات، بۆماوەی یەک ساڵی ڕەبەق ئەم شـــێوە بەتام و لەزەت و چێژدارەمان دەخواردی بەندی و نەخۆشەکانی هاونیشتیمانی خۆمان دەدا، بەلامانەوە هیچ گرنگ نەبـــوو، گرنگ فرەقازانج بوو، لەم بارەیەوە ســـەلیمە گۆجی هاوبەشـــم لەتریقەی پێکەنینـــی دەدا دەیگوت: (ئەو نەخۆشـــانە چاکیش ببنەوە هەر دەمرن) کەواتە بەرلەوەی بمـــرن، بائێمە مانان خێریان لێ ببینین، دەیگوت: گیراوەکانیش حەقە مستن، چونکە مسۆگەر بزانە ئەوانە لەسەر دزینی مریشک بەندکراون، تیایاندا هەیە لەسەر دزینی مزەخەیەکی ئاوی مزگەوت گیراوە، ئەو پیســـکە دزانە لەناوبانگ و شوهرەتی گەورە دزانی وڵات کەم دەکەنەوە، بۆیە ئەم سڵقاوەشیان لێ حەرامە.)

بەڵێ ئەرباب، کەســـەرکردایەتی سیاســـی وڵات دووچـــاری لەخۆبایی بوون و لاســـاریی و سەرەڕۆیی دەبن، وڵات دووچاری کارەساتی دڵتەزێن و میللەت بەرەو ئاقاری هەڵدێر دەبەن، شیرازەی ژیانی کۆمەڵایەتی لەباریەک هەڵدەوەشـــێتەوە، یاســـا پێشـــێل دەکرێ، گەندەڵکاری پەرەدەســـێنێ، مشـــەخۆر و هەڵپەرست و دزو جەردەی وەکو (من و سەلیمە گۆج) چینەی لێدەکەین.

کەســـاڵ تەواو بوو گرێبەســـتی کارەکەمان بەکۆتاهات، زۆر لەدڵمدا گران بـــوو، تەماحگیرببووم، داوام لەگۆجەی هاوبەشـــم کرد، بادووبارە گرێبەستەکان نوێ بکەینەوە، گوتی:

(نەخێر، تۆ نازانی، هێشــتا نومای، ئەوەقومارە، قوماربازی بلیمەت و هۆشــمەند، ئەو قوماربازیە کەلەدەســتپێکی یاریدا دەستەگوڵی خۆی لێدەدات، دەست دەکێشێتەوە لەیاری کردن، ئەگەرنا؟! لەدیماهیدا دەست لەگونان دەمێنێتەوەدرێژەی پێدا گوتی: خەمت نەبێ ئەوها تێک نەدراوە چاکبێتەوە، هەتــا ئەو گەڕەلاوژەیەش لە ئارادابێــت، تائەو کونە مابێ ئەم بایەی هەرلێدێت، جارێ برۆ پشــووەک بدە، باگیانت ئاسوودەبێت، چاوەڕوان بە بزانین لەڕۆژانی ئایندەدا چی ڕوودەدات؟! هەنگین بەگوێرەی بارودۆخ تێهەڵدەچینەوە.)

بەندە، بەرلەوەی لەگەڵ گۆجە ببین بەهاوبەش، وەکو دزێکی ناقوڵاو لێزان شــانازیم بەپیشــەو کردەوەکانی خۆم دەکرد، کاتێ کەدوابەدوای بانگی نوێژی بەیانی دەچوومە ســەرماڵان، کۆنە جاجم بووایە، کەچەلباد بووایە، کەونە پەڕو لێفەشــڕە بووایە لەســەر پشتی ژن و منداڵان تێڕوو دەهاتــم دەمرفاند، یان کەبەدەمانچەی پلاســتیک پێشــم لەکابرایەکی بــێ چەک و بەتای کراســی و دەرپێ دەگرتەوە کورتەک و شــەرواڵ و کەوشــەکانیم لــێ دەســتاند، یان بەهــۆی چۆڕێ عارەق، مریشــک و کەڵەشــێرم ســەرخۆش دەکردن، گیرفانی خۆم پێیان گەرم دەکردەوە، لەپەنا ئەم کردەوە تروهاتانەوە بەشــانازییەوە نــاوم لەخۆم نابوو (دز) پێموابوو کەسەرتاســەری وڵاتدا دزێکی وەکو خۆم ئاسای بەجورئەت و چەڵەنگ و عەگیدو مێرخاسی تێدانیە شان بدات لەشانم، ئەوەیە دەڵێن! ((لەبێ خەبەران کەشکەک ســەلەوات)) ئەوە دەقاودەق بەسەرەخۆمدا دەشــکێتەوە، خۆم، بەخۆم دەگوت: تڕحێــو، منیش بەخۆم دەڵێم دز، وەللاهی شەرمە بۆمن بەخۆم بڵێم دز، ئەسڵەن چاوو ڕووی دەوێ بەخۆم بڵێم دز، بەســەلیمە گۆجیش بڵێن دز، ئاخر من تۆزی بن پێی ناشکێنم لەفرت و فێڵ و کەڵەکەبازی و دزی و چاو بەســتانەوە، من هێشتانەکێ تــازە بەرێوەم، کەچی گۆجە لەوســەر گەڕاوەتەوە، ئەو! بەزەبری هێزی دراو گــەورە پیاوانی دەوڵەت لێ دەکات، چەشــنی ماین بۆی ڕام دەبن، پارە بەرد نەرم دەکات، کەپارەیان بۆ ڕاگرێ، بەئەسپایی دێنە بەردەستی

گوێی خۆیـــان بەردەدەنەوە، جاحەزبکات لغاویـــان دەکات، یان مەرامی لێبێ بەبێ لغاو سواری پشـــتیان دەبێت، ئیتر بێ دڵەڕاوکێ بەهەوەسی خۆی لێیان دەخورێ.

:بیســـتومە دەڵێن: باوە گەورەی شـــەیتانەکان ســـێ پێیی لەخۆی هەڵدەدا هەڵدەپەڕی سەمای دەکرد، شەیتانە بچکۆڵەکان لێیان پرسی:

- باوەگەورە پێمان بڵێ بزانین ئەم شـــایی و هەڵپەڕکێ و خۆشیەت لەپای چییە.؟! گوتی:

- ڕۆڵەکانم، ئادەمیزاد (ســـکە)ی پارەی دامەزراندووە، پارەو پووڵ دروســـت دەکەن، لێرە بەدوا ئێمە ئیســـراحەت دەکەین، چونکە هەرچی ڕەوشتی بەرزی مرۆڤایەتییە بەهۆی پارەوە لەدەستی دەدەن، باب و کوڕ دەست دەنێنە خنخنۆکی یەکدی،

بەڵێ ڕاستە، شەیتان ڕاســـتی فەرمووە، ئەی ئەوە نییە کەمرۆیەکی پارەدار کۆچی دوایی دەکات، بەســـەدان ماشـــێن بەدوای دارەبازەکەیدا ڕێچکە دەبەســـتن بۆ گۆڕستان و بەخاکسپاردنی، لەڕۆژانی پرسەو سەرە خۆشیشـــدا، خەڵک وەکو شارە مێروســـتان ڕێچکە دەبەستن، ڕێ وەبەر ڕێبوار ناکـــەوێ، بەڵام کەهەژار و نەدارێکی بێ نەوا وەغر دەکات، کەس بەخەیاڵیـــدا نایـــەت کەئادەمییەک فەرمانی یەزدانـــی بەجێ گەیاندووە، ئەســـڵەن ئاوڕی لێنادەنەوە، هاوچەشـــنی پشـــیلە تۆپیوی سەرشەقام ســـەیری دەکەن، کەلەژێر تایەی ترومبێل تولڵخاوەتەوە، ئەوە هەمووی باندۆڕی دراوە، وای لەخەڵک کردووە، لەحاڵەتی مردنیشـــدا پێشـــوازی لەکەسانی دەوڵەمەند و دەسەڵاتدار و پشت ئەستوور دەکەن، چاوپۆشی لەپۆخڵـــەوات و کاروکردەوە و دزێوو گورگانییەکانیان دەکەن، بەڵێ دنیا گۆڕاوە، نەخێر ببورن! خەڵکەکە گۆڕاوە، بەڵام چ گۆڕانێک گۆڕاوە؟!

لەتاریکییەوە بۆ تاریکســـتان، لەسەردەمانێکدا خەڵک دەبوونە موریدو دەروێشی سەیدو شێخان، دەستەو نەزەر لەحزووریاندا دەنووشتانەوە، کەچی ئێستاکێ بوونەتە پاکارو کۆیلەی پیاوی زەنگین و دەست ڕۆیشتوو، بوونەتە دیل، دیلی پارە، بۆ بەدەســـتهێنانی پارە هەر ڕۆژەو لەســـەر کوریســـێک

یاری دەکەن، هەر ڕۆژی ڕەنگێک دەپەرســتن، وەک ئەوەی لەپەرســتگابن بەدەوری ڕەنگدا دەخولێنەوە، پەرستگا تیلمە پەڕۆیەکی ڕەنگدارە سوژدەی بۆ دەبەن، ژنان بۆ (هێما)ی جوداخوازی لەدەلینگە دەرپێ و لەچەکی مل و دەسترۆکەی سەریان بەکار دێنن، وەلێ ئەگەر هاتو ڕۆژێ لە ڕۆژان ڕەنگی ئەم پارچە پەڕۆیە لەگەڵ بەرژەوەندییەکانیان تێک نەکاتەوە یەکانگیرنەبوو، دەیخــە ژێر پێ و ڕیزاڵ بەڕیزاڵی دەکەن، بگرە وەک پەڕۆ بێنوێژی بەکاری دەهێنن، زۆر بێ شــەرمانە دوابەدوای جووتبوونی تەڕاتێنگە، هەردووکیان خۆیان پێ خاوێن و هیشک دەکەنەوە، پاشان بۆ ناو تەنەکەی زبڵ، ببورن! تێمپەڕاند، بابگەڕێینەوە بۆ سەر ئیشوکار.

ڕۆژێکیان ســەلیمە گۆج، تیلاکی هێنابووە سەر ئەبرۆی، جغارەیەکی (دیمۆرێــن)ی بەلالێویەوە وەگرتبوو، ڕانــک و چۆغەرێکی ڕەنگ مامزی پۆشیبوو، کڵاشــێکی پەڕۆینی دەستکردی ناوچەی هەورامانی بەسۆلانی بەســەر پێی وەکردبوو، مەپرســە ؟! شــای بەخولام ڕانەدەگرت، یاغر یاغر بەڕێوەبوو دەهات (بەلاتانەوە ســەیرنەبێ، لەو ئانەدا دیقەتم دابووە گۆجەی هاوکارم، پێموابوو کە جگە لە کەللەی ســەری، ئەگینا تەواوی جەســتەی لەپێش چاومدا جەســتەی کەمتیاربوو، کاپێلکی کەللەسەری کتومت کاپێلکی کەللەی ســەری ڕێوی یەکی گەڕیدەی قاڵبوونی فرت و فێڵ بوو.)

مــن قەت بەناوی خۆی بانگــم نەدەکرد، بە (شــاباز) بانگم دەکرد، هێشتانەکێ لەو بەری شەقام بوو هەستامەوە سەرپێ بانگم کرد! دەفەرموو کەرەمکە شابازبەگ، ئەمجارەیان بەگیشم بۆی زیاد کرد، گوتی: واهاتم، هات لەسەر کورسی دانیشت، لنگی تێک پەڕاند،گوتی:

ـ بنێرە چایەکی خەستم بۆبێنن، حەزم لەچایەپێمگوت:

ـ وادیارە قاوەڵتییەکە زۆر چەور بووە.؟!

پێکەنی گوتی:

ـ چەوروبەس، خودا لەسەروماڵی (بەگزادە) بەزیادی بکات.

ـ ئەو بەگزادەیە کێیە قوربان.؟! گوتی:

ـ ئارامت بێ باچایەکە بخۆمەوە، پشووبدەم، دواتر دەچینە سەرباس و خواس.

ســـەیرلەوەدابوو، هێند بەتام و لەزەت فڕی لەچایەکە دەداو دووکەڵی جگەرەی بەسەر داهەڵدەمژی، لەکونەلووتیەوە دووکەڵەکەی بەبادەدا، زۆر ســـەرنج ڕاکێش بوو، مرۆ سوقی دەبۆوە، حەزی دەچووە جگەرەکێشان، دواتر هاتەوەگۆو گوتی:

(بەگـــزادە، زاتێکی ماقـــوڵ و خانەدان و ناوداری شـــارە، تابڵێی: دەوڵەمەندو دەســـت ڕۆیە، لەم وەرزی هاوینەدا قۆنتەراتی گەنم و جۆی گرتووە بۆ سایلۆی شار، ئەگەرچی کارەکە وەرزییە، ماوەکەی زۆر کورتە، بەڵام پرخێرو بەرەکەتە، دەبێ قۆڵ و باسکمان لێ هەڵماڵین، شەو و ڕۆژ بخەیتە سەریەکدی، جا بۆ ئەوەی ئەم هەلە لەدەستە خۆمان نەدەین، من و جەنابی بەگزادە ڕێک کەوتووین، باسی تۆشم بۆی کردووە، لەم ڕۆژانە بەیەکەوە دەچین بۆ خزمەتی جەنابی بەگزادە وابێ بتناســـێ، جائەوەی لەســـەر ئێمەیە دەبێ بڕۆین بۆ ئەم گوندەو دێهاتانەی کوردســـتان، لەو گوندانەی هێشتا بەپێوە ماون، گەنم و جۆ بکڕین و بیگوازینەوە بۆ (سیف) ی بەگزادە لەشار، ئەوە کاری ئێمەیە، ئیتر لێرە بەدواوە جەنابی بەگزادە خۆی تاوتوێی دەکات و بەسایلۆی دەسپێرێ،

ـ جا نازانم تۆ دەڵێی چی.؟!

ـ دەڵێم چیلەمە چاکتر دەبێ چی بێت.؟!

بەگزادە، پیاوێکی باڵابەرز، تەنگەســـتوور، سوور و سپی، موو زەرد، چاوشین، مل کۆپەران، ئەوە بەرغەبابەی بوو، برژانکی چاوی هەڵوەرابوو، چاوی وەک قوونە مریشـــک وابوو، هەردەم پتەپیتیان بوو، جاری وابوو کەواو سەڵتەی دەپۆشـــی، عەبایەکی تەنکی عارەبی بەسەردا دەپۆشی، هەندێ جاریش دزداشەی شۆڕی ئاو دامێنی لەبەردەکرد، تەنکەڕدێنەکی بەردابووەوە، وەڵڵاهی نەک فەرمانبەری دەوڵەت، شـــەیتان بەشـــەیتانی خۆی شـــەرمی لێدەکرد، لەحزووریدا دەســـتەونەزەر بۆی دەهاتە ســـەر چۆک.

ئیدی دەستبەرکاربووین، گەنم و جۆمان لەجوتیار و فەلاح و تەڕاحان دەکڕییەوە، پاشان بەلۆری حەواڵەی سیفی بەگزادەمان دەکرد، بەرێکەوت چەندجار دەمدیت! بەگەڵاب گڵیان لەسەر ڕەوسەی گەنم ڕوو دەکرد، دواتر بەشۆفەڵ سەراو بنیان دەکرد، تێکیان هەڵدەشێلا، پاشان هەربە شۆفەڵ لەگەڵابان باریان دەکرد، لێخوڕە بۆ ســـایلۆ، سەرم لەکارە سووڕ مابوو، کوو؟! ئەم گەنمە لەتاقیگـــە دەردەچێت و بێ گرێ و گۆڵ وەردەگیرێ، ڕۆژێکیان لەگۆجەم پرسی:

-ئـــەرێ تۆ پێمبڵێ بزانم بەگەڵاب ئەم گڵە تێکەڵ بەڕەوســـەی گەنم دەکەن، جگە لەوەی کێشـــی لەسەر قەپان زۆر زیاد دەکات، ئەوە هیچ، بەڵام ئەوەی مایەی سەر ســـووڕمانە تێماوم، ئەم گەنمە چۆن لەتاقیگە بەنمرە یەک وەردەگیرێ.؟!

گۆجە بەپێکەنینەوە گوتی:

-وەیش چەند سادەو ساویلکەی، هێشتا ماوتە (نوما)ی.

گوێبگـــرە! کەئەم گڵە تێکەڵ بەم گەنمـــە دەکرێ، گوایە ئەم گەنمە کوورکی هەیە، بەهۆی ئەم گڵەوســـەراوبن کردن و تێک هەڵشێلان خاوێن دەبێتـــەوە کوورکی نامێنێ، پێداچوو گووتـــی بەڵام تەڕەماش و ترخێنە و کوورکـــی چی؟! ئەوە فێڵی بن فێڵانە، بـــەڵام چۆن لەتاقیگە بەنایاب دەردەچێ؟!

ئەوەیان ئاســـانە، جەنابـــی بەگزادە، لەتەنافبازی و زمان لووســـیدا لەوسەری هاتۆتەوە، دەمی یەکە یەکەی فەرمانبەرانی چەورکردووە، لچی کردوون، جابۆ شەرعیەتدان بەدروستی تەخمینی تاقیگە هەندێک گەنم لە گەنمـــی یەکێکی دیکە، لەجیاتی گەنمی بەگزادە دەبەن بۆ تاقیگە، پلەی نمرەیەکی پێدەبەخشن، حاڵی بووی یان نا.؟!

ـ بەڵێ قوربان چاک لێی حاڵی بووم، بەرتیل پەردەیەکی ئەســـتوور ئەستوورە، عەیب و عاری بۆرە پیاوان دادەپۆشی.

(داخی گرانم، پارەو پلەو پایەو کورسی و ڕەنگ وبالا دەستی بوویتە پێوەری بن چینەیی بۆ پۆلێنکردنی ڕەش وسپی، بۆیە لیخن بووە.)

ئیتر لەسـایەی کەواو سەڵتەو عەباو مێزەرو کەشیدەی بەگزادە، بەم ماوە کورتە خۆمان دارماڵ کردمن بەزەییم بەڕەش ورووت هەژارو نەداری وڵاتەکەماندا دێتەوە خەوێکی قورس پێڵووی چاوانی گرتوون، لەترسـی حەرام و حەڵاڵ بەزگێک تێرو بەدووان برسـین، شەوان بەهەناوی بەتاڵ دەچنە ژێر پێخەف، نەکەوشیان کەوشە، نەجلوبەرگیان جلوبەرگە، ئاگریان تێبەر دەبێت بۆن سـۆیان لێنایەت، بـەڵام بەهێزی ئیمان و بڕوابوونیان بەیەکتایـی پەروەردگار، بەهەسـت و ڕۆحیەتی نیشـتیمانپەروەریی و بەچارەنووس و بەشـی خۆیان شوکرانە بژێرن، داواکارن لەیەزدانی مەزن لەش سـاغی و شـەرەف وناموس و کەرامەتیان بپارێزێ، پێنج فەرزە دەستەو نزا دەپارێنەوە، ئەتاجی دەستی پیاوی نامەرد نەبن.

ئیتـر بالێرەوە خەڵکی ڕەش و ڕووت و ڕەوشـت بـەرزی وڵات، بۆ ڕۆژە ئێشـێک خەریکی نزاو پاڕانەوە بن، بەڵکو بەپارەی حەق دەست و ئارەقەی نیوچەوان و ماندووبوونی ئەم ڕۆژە کارکردنەیان ئەگەر بەشـی یەک ژەمە خواردنیش بێت، هەنـاوی خاوخێزانیان پێ گەرم دەکەنەوە، بەزگی تێر سەرخەو دەشکێنن.

-١٥-

-قەت بەدرۆ نەگوتراوە! (هەر شـــەرەک بۆجوامێرەک) بەڵێ ڕاستە، پیاوی عەگید دەیکات، کەچی بۆرە پیاو خۆیان پێ هەڵدەکێشن، بەپای پیـــلان چینەی لێدەکەن، هاوچەشـــنی من و گۆجە و بەگـــزادە، دێینە ســـەر حازرەکی خۆمان پێ بادەدەین، لەشـــەوانی سووردا تەفروتوونای دەکەین.

بەڵـــێ لەڕۆژانی ڕاپەڕین وکۆچـــڕەودا خەڵکانێک ســـینگیان دابووە بەرگوللە، قەیسەرییان لەپیاوانی بەعس کردبووە کونەمشک، کەچی ئێمە هەرسێکمان یەکدی گر ببووین قۆڵ و باسکمان لێ هەڵماڵیبوو، خەریکی دزینی پاتارو ئۆتۆمبێڵ بووین ئاودیومان دەکرد، چەتەوڵەکانی بازگەکان وەک ئەوەی بڵێی: جەنابی بەگزادە دوعای دەم بەســـتانی بەســـەریاندا خوێندبێت، لەئاســـت ئێمەدا دەمیان قرمســـابوو، شـــەوان ڕاوەستانمان نەبـــوو، ئۆتۆمبیل لەدوای ئۆتۆمبێلمان ئاودیـــو دەکرد، کەچی هەر ئەو چەتەولانەی بازگەکان لەســـەر سنوور، ســـەبارەت بەخەڵکی هەژارو بێ

پشـــت، چمه لێدەگەڕان یەک (تایە) چییە؟ئاودیو بکەن، وەک زەرگەتە بەڕوویاندا هەڵدەشـــاخینەوە، بگرە بەناوی نیشـــتیمانپەروەریی قسەی قووڕوبـــن دراپـــان پێدەگوتن، وەک ســـەگ، نەخێر، ســـەگ بەوەفایە، وەکو پشـــیلە بەڕوویاندا دەڕشـــانەوە، بازگەی چـــی و ترخێنەی چی؟! گەڕەلاوژەیـــەک بـــوو، هەرمەپرســـە؟! لەمەرزی حاجییـــەوە بگرە هەتا دەگەیشـــتیە هەولێر، بەدرێژای ڕێگا هەرشـــارەدێیەک دەستەیەک لەزڕە پێشـــمەرگە یەکانگیـــر ببوون (لەگەڵ ڕێـــزو تەقدیرم بۆ پێشـــمەرگەی ڕاســـتەقینەی کوردو کوردســـتان)بازگەیەکیان قیـــت کردبۆوە خەڵکیان دەڕووتاندەوە، هێواران خەرمانی پارەیان لەنێوان خۆیاندا دابەش دەکرد، ئەوەی کەزۆر بەلامەوە سەیروسۆبەت بوو لەو ڕۆژە ڕەش و تەنگانەیەدا، ئەم زڕانە دەمڕاســـتی بەرەی کوردســـتانی بوون، لەوەش سەیرتر ئەوە بوو! بازگەی چۆمان، ددانی بەپسوولەی حاجی ئۆمەران نەدەنا، بازگەی سۆران، ددانی بەپســـوولەی فەرمی بازگەی پێشە خۆی نەدەنا، بازگەی شـــەقڵاوە و کۆڕێ هەربەهەمان شـــێوە نەیدەخواردئەوەی یەک کارتۆن هێلکە، یان کارتۆنەک دۆشـــاوی تەماتە، یان جبســـی منداڵان پێبووایە، دەبووایە پـــارەی گومرگانە بژمێری، ئەگەر پێگیـــری و چەند و چوونی کردبایە؟! بەخائین و تابووری پێنجەم دەدرایە قەڵەم، ئیتر لەم بازگە بۆ بازگە، بازگە لەبازگەی هەڵدەدا، ئێمەش وەک بەرزەکی بانان بازگەکەمان شەق دەکرد، کەسێک نەبوو بڵێ: لەل.

جەنابـــی بەگزادە، لەناو ئەم جۆرە کارو ســـەودایانەدا ســـەری تێدا کوڵابـــوو، قەت تێنەدەکەوت، کەمۆ بوو، بگرە لەدیوی ئەودیویش بنکەی داکوتـــا بوو، هەرچی شـــۆفەڵ و ئۆتۆمبێل و شـــیش و ئـــەو ئامێرانەی من و گۆجە، جگەلە دەســـتکەوتی خۆمان، هی دزیاریشـــمان لەدزەکانی دیکە دەکڕییەوە بەهەرزان، دواتر ئاو دیومان دەکردن، ڕادەستی بەگزادە دەکـــران، دوای ســـاخکردنەوەیان بەدراوی فەرمی، پاشـــان ئەو پارە و پوولەی بەدراوی (قەرپ) دەگۆڕییەوە، بەگزادە، هەتا شـــوێن پێی خۆی مسۆگەرنەکردبایە؟!

قەت شـــەقاوی نەدەهاوێت، بۆ ســـاخکردنەوەی پارەی قەڵپ، شوێن پێی خۆی پەســـتابووەوە، پێشـــتر لەگەڵ داکە دزی بانق کاکەو برالەی خۆیـــان کردبوو، کوو لەدەفتەر حســـاباتی بەگزادە تۆماری بکەن، دوای ماوەیـــەک بەدەفتەر چەکی تایبەت بەبەگزادە، کەپێشـــتر بۆمن و گۆجە واژۆی کردبوو، هەرســـێ، چوار ڕۆژ جارێک هەندێک پارەی ئەســـڵیمان وەردەگرتەوەئەو مرۆیە وەکو جادووکەر وابوو، زۆر هەستیار و بەئاگا بوو، زوو پێ حەســـیابوو دراوی قەرپ لەبازاڕدا پەنگاوی داوەتەوە، ڕۆژێکیان لەنامەیەکدا بۆ ئێمەی نووسی بوو! (کەجام پڕ بوو لێی دەڕژێ)بۆیە هەتا زووە بەدەســـت گەرمی کۆتایی بەحیســـاب بێنن، لەگەڵ بانک بیبڕنەوە، بەپشـــتیوانی خودا لەم ڕۆژانەدا دێمەوە، ڕێگایەکی دیکە، کونێکی دیکە دەدۆزمەوە بۆ ساخکردنەوەی دراوی قەڵپ.

کابرایەکی کـــون دۆزەر بـــوو، کەهاتەوە چووە بەغدا، حەوشـــێکی سەربەخۆی بەکرێ گرتبوو، بەمەبەستی ڕایی کردنی کاروبارو چاوبەستنی پیاوانی ســـیخوڕی ڕژێمی بەعس، بەشـــێوەی (ســـیفە)، سێ دەلیسەی لای خـــۆی دانابوو، شـــەوانیش وەکو تەگەی عالۆری تێیـــان بەردەبوو دەیتەقاندەوە، من و گۆجەش کەلەڕێگەی قاچاخچیاتی سەرسنوور پارەی قەڵپمان بۆ دەهات، دەمانبرد بۆ بەغا، کەشەو دادەهات لەسەر شەڕەفی ئێمـــە مێزیان دەڕازانـــدەوە، دواتر دادەمەزراین، شـــەش قۆڵی پێکمان هەڵدەدا، لەهەمووی خۆشتر ئەوەبوو! کاتێ بەگزادە تەواو مەست دەبوو، بەتای کراس و دەرپێی ســـپی دادەنیشـــت، داوای لەخانمەکان دەکرد، خۆیان تەنهـــا بکەن مەی تێبکەن، ئەوجـــا زۆر بەنەرمی گۆرانی (خانم، خانم، خانمی، گوڵی نێـــو باخانمی) بەپچڕ پچڕی دەچڕی، دەبووایە من و گۆجە بەچەپڵە و سۆزانییەکانیش بەسەماو قوون بادان جۆشی دەین، هەندێ جاریش بەفشـــقیات و بەقسەی شـــڵتی وپڵتی بەپێخواسی بەناو دەکەوت، هەتا درەنگانی شەو لێمان دەخوڕی، پشتی هنگێ دوو، دوو بۆ ژووری ڕازاین دەخشین، هەتا چێشتەنگاوێکی درەنگ وەکو ماری ئاشقەو ماشقە تێک دەئاڵاین.

ئەوجا کەلەخەو هەڵدەستاین، دوای گەرماو و قاوەڵتی، پۆشـــاکی ســـەردەم و شارســـتانیانەمان دەپۆشـــی، هەریەکە و قۆڵمـــان لەقۆڵی خانمێک هەڵدەکێشاو برۆ، بازاڕی زێڕینگەران خۆت بگرە واهاتین.،بازاڕو ســـەوداوکڕین و فرۆتن هەینێ لەشـــاری بەغدا، بەهۆی نەبوونی یاســـاو بەربەرەڵلایـــی و گەندەڵی، تێکوتین و تێبڕین و بگێم بگێم کەس بەکەس نەبوو

(ئەوەی مایەی سەرسوڕمانە لەکڕین و فرۆشتندا،، پیاوان لەبەرامبەر ژنانـــدا تابڵێـــی: بێ هێزو بێ ورەن زوو دەســـتەمۆ دەبـــن، وەک بەفرو ڕەشـــەبان، بەزەردەخەنەنێک، بەخۆلێخشاندنێک، بەچاوداگرتنێک دەبنە هەویری بن دەستان بەماچێک لچیان دەکەن).

ئەو ســـێ خانمەی هاوکارمان، لەم جۆرە کارو کردەوە شەیتانیانەدا ســـەریان تێدا کولابوو، ماتەڵ نەدەبوون جاکـــە ڕوومان دەکردە دوکانی هەر زێڕینگرێک، بەپێـــی پلان و ڕێنمایی بەگزادە، خۆمان لەگێلی دەدا، بوارمان بە زێڕینگەڕو خانم دەدا، بۆ چاوبڕکێ و دەستگوشـــین و خۆلێک خشاندن، بگرە ناوە ناوە بەسرتە و چپە دەدوان، گوایە ئێمە قەللاجین، واتا (لەڕاوکەری نوێ وابی، ڕاوکەری کۆن خەوتووە.)

(ئافەریـــن زەلام چـــزوو؟! دەبنە خاکو خۆڵی ژێر پێـــی ئافرەتانی ناجســـن و دامێن تەڕ، بێگومان بەهەمان شێوەو گفت و لفت بۆ ژنەکانی خۆیان نەپێدەکەنن نەدەســـتە مۆدەبن، بەڵکو بەپێچەوانە زۆر بەڕەقی و هیشکی دەیاندوێنن، مەگەر لەحاڵەتی هیشکەتی و تەوژمی پاڵە پەستۆی هۆڕمۆنی تەڕاتێنگەو دامرکاندنەوەی جەنابی (شـــێخ دارەلووس) ئەگینا ئاوڕیان لێنادەنەوە، ئەوانیش لەم ڕقەو بۆتۆڵە ســـەندنەوە، دەستەکەن بەفیشەک دزین و لەسەری ڕادێن.)

ئابەم چاوداگرتن و خۆلێخشـــاندن و خەندە بازییەوە، زێڕینگەرەکان ســـەرچیخ دەچوون، لەنـــرخ بۆیان دادەشـــکاندن، ئەگـــەر بوارمان بۆ ڕەخســـابایە؟! بێگومان دەســـتەگوڵی خۆمان لێدەدا، یەک، دوو پارچە ئاڵتوونمان لێ دەدزی.

لەم ســـەوداو دزین و کەڵەکەبازییەدا، خانمەکان لەدووسەرەوە سوود بەخش بوون، لەسەرێکی دیکەوە، بەگوتەی خۆیان!

(لەدەست چەتەوڵەکانی کورەکانی دکتاتۆر حەساینەوە، ئەو دڕندانە شەوان تاوەکو ڕۆژ دەبێتەوە، بەبێ خواست و ئارەزوومان لێ بێت، بەزۆری زۆردارەکی لای خۆیان گلمان دەدەنەوە و دەمانتەقێننەوە، ســـبەینانیش شاپێکی تەڕمان تێ هەڵدەدەن، بێ قاوەڵتی ترۆمان دەکەن.)

دوای ئەوەی ســـێ، چوار جاران زەبری خۆمان وەشاند، بەفەرمایشی بەگزادە پای دۆزمان لەشاری بەغداکرد، خانمەکان ئەو ڕۆژە زۆر بێواز و دڵ تەنگ بوون، فرمێسک لەچاویاندا قەتیس مابوو، دەیانگوت:

(لەخەمی ئەوەداین دیســـان دەکەینەوە بن دەست و چۆکی دوودەکی و زۆڵ و سەرســـەرییەکانی چەتەوڵەکانی کورەکانی دکتاتۆر.) بەهەرحاڵ کەسواری تورەمێل بووین، بۆ دواجار ماڵاواییمان لێیان کرد، هەرسێکیان چەنـــد هەنگاوێـــک بـــەدوای ئۆتۆمبێلەکـــەدا هاتن هەتـــا لەپێچاییەکە ســـووڕاینەوە، لەئاوێنەی لای ڕاســـتەوە چاوم لێبوو زۆر بە پەرۆشـــەوە لەجێوە چەقین، زۆربە مەحزونی تەماشای ئێمەیان دەکرد، هەستم پێکرد جەنابـــی بەگزادە دڵ و دەروون و چاوی لای ئـــەوان بوو، لەئاوێنەکەوە ســـێرەی لێیان گرتبوو، بەرلەوەی شـــوون و بزر بیـــن لەپێش چاویان، بەگزادە دەســـتی دەردێنا، بەدەست ڕاهەژاندن بەیبای لێکردن، ئەوانیش بەهەمان شێوە بەیبایان لێکردبەڕێگاوە لەجەنابی بەگزادەم پرسی:

ــــ ئەرێ قســـەی خۆمان بێ، پێـــم ناڵێی بزانم بۆچـــی ئەوخانمانە وابەپەرۆشەوە گریان لەهەوکیاندا مابوو.؟!

دیاربوو ئەم پرســـیارە پڕ بەدڵی بوو، بۆیە زەردەخەنە بەسەر لێوی داهات، گوتی:

ــــ وادیارە بەم تەمەنەتەوە هێشـــتا هیچ لەژیانـــی ئادەمیزاد حاڵی نەبووی، ژیان لەســـەر بەرژەوەندی دروســـت بووە بەپێـــی بەرژەوەندی دەچێتەڕێـــوە، ئەگـــەر بەرژەوەندی لەنێواندا نەمێنێ؟! شـــێرازەی ژیان لەبارییەک هەڵدەوەشـــێتەوە، وەکو پەککەوتە پەکی دەکەوێدواتر لەقاقای

پێکەنینی دا، پێداچوو گوتی: لەژیاندا پیاوی وا هەیە ناوچەوانی نوورانییە، خێرو بەرەکەتی لێدەباری، پیاوی واش هەیە شـــانس وبەختی لە (زەرگ) ییەتی، بـــەزەرگ لێدان پارووی دەکەوێتە رۆنـــی چینەی لێدەکات، هی واش هەن نیوچەوانیان دمۆرە، لەهەردووکیان دەســـت لەگونانە، بەزگێک تێرو بەدووان برســـییە، لەبەرئەوەی ترسنۆکە، بێگومان هەربەبرسییەتی سەردەنێتەوە، چونکە پێیوایەکە ئەم رەوشە ئاڵۆزەی سەرتاسەری وڵاتی گرتووتەوە، گوایە ئەوە ئیرادەی پەروەردگارو قەزاو قەدەرە، لەئەزەلەوە لەچەهرەیدا نووسراوە، دەبێ پێی ڕازی بێ، شانی بداتە بەرێ، هەتا ئاوی پێی دادەچۆڕێ هەردەبێ ڕایکێشێ

:جگەرەیەکی چرووتی کوبایی داگیرســـاند، دوو، سێ چەسپی توندی لێدا، دواتر تێهەڵچووە گوتی:

سەبارەت بەژیانی مرۆڤ تالە ژیاندا مابێ، دووڕێگەی لەپێشە! ژیانی مەڕ، ژیانی گورگ، مرۆ لەهەردووکیان سەرپشـــکە، کامیان هەڵدەبژێری ئەگەر ژیانی مەڕ هەڵبژێری؟! دەبێ حیســـاب بۆ گورگ و کێردی قەساب بکات، ئەگەر ژیانی گورگی هەڵبژێرێ؟! بێگومان نابێ باکی بەهەلەلەو هاتوهاواری شوان و حەپەحەپی سەگەڵ بێ، هەینێ لە ئەوپەڕی سەربەستی و بەتێرو تەســـەڵی لەسەر حیســـابی خەڵک وەک پاشازادە دەژی، واتا لەوڵاتێکی بێ ســـەروبەرو بێ یاسادا، نابێ مرۆڤ بەقەرد بترسێ، ئەگەر هەڵی بۆڕەخسا؟! نابێ بەسەریدا بازبدات، ئەگەر بازبدات؟! بەردەبێتەوە دەکەوێتە بن دەســـت و پێی خەڵک، هورگی بەگۆڕێ وەردەکەن، دڵنیابە ئەگەر تۆ عەگیدو نیشتیمانپەروەرێکی بەناوو دەنگیش بی؟! مادام کەوتی کەســـێک نییە ئاوڕت لێبداتەوە، بێ بن پیلت بگرێ قیتت بکاتەوە، وابی هەڵســـییەوە سەرپێ، هەروەکو کورەکەی ڕەزاشـــا، لەعاسمان و لەسەر گۆی زەمین کەســـێک نەبوو بەمیوانی داڵدەی بدات، خۆ بەچاوی خۆتان دیتتـــان؟! ڕۆژانی کۆرەوی میللەتێـــک، چ لەگەڕەلاوژەیەک بوو، ئەوەی بەزەیی و سۆز و هەستی مرۆڤایەتی بوو؟! تۆی لێبڕابوو، کەچی لەگەرمە گەرمەی کۆچڕەودا، گورگەکان دەســـتەگوڵی خۆیان لێدا، خۆیەک، یەک

وەک گای قەرەبەش وادیارن، بێگومان بەچاوی خۆتان دەیانبینن، هێندە لەخۆبایـــی بوونە لەپێســـتی خۆیان دەرچوونە، بەئـــاوو هەواوو ژینکەی وژیانی ئێرە دڵیان داناکەوێ، کەچی دەســـت بەرداریشـــی نابن چەورە، بۆچینە و قاچاندنەوە دەســـتیان لێرەو (پێ)یان لەئەوروپایە، سەرباریش دەبێ هەژارو خوێن ڕژاوەکان نازوفیزیان هەڵگرنهێشتا گوێم دابووێ.

:گۆجەبڕێکی داگرت، بازگەبوو، بازگەی دەروازەی شاری کەرکوک

کات عەســـرێکی درەنگە، لەهـــەردوولاوە هەتا چـــاو هەرەتەدەکات، ئۆتۆمبێـــل بوو، خەڵک هاوچەشـــنی دیل، کزومەلوول لەقەراغ شـــەقام پشـــتیان دابـــوو ئۆتۆمبێلـــەکان، چاوەڕوانـــی بەزەیـــی چەتەوڵە کڵاو ســـوورەکانی بازگەبـــوون، کەی دڵیان نەرم دەبێـــت، بەگزادە، هەندێک پارەی خســـتەگیرفانی کەوای لە ئۆتۆمبێـــڵ دابەزی، هندامی خۆی ڕێک خســـتەوە، عەباکەی کردەشـــانی پێی گوتم: وەرە، جەنابیان لەپێشەوە هێـــدی، هێدی بە هەنگاوی هورد هورد دەڕۆیی، بەندەش لەدواوە بەپێی ئەو ڕێم دەبڕی، جەنابی بەگزادە بەڕێوە بەدەســـت سڵاوی لەحەشیمەتی ئاپۆرای موسافیرانی لاڕێی بازگەکە دەکرد، خەڵکی ڕەش و ڕووت و داماو زۆر بەگەرمـــی وەڵامیان دەداوە، بەچاوی ئومێدو فریادڕەس دەیانڕوانێی، ئیدی بووە غەڵبە غەڵب، لەوکاتەدا ئەفســـەری سەردەستەی بازگە وەکو ڕێـــوی خۆی لەکونێدا مـــەلاس دابوو، وەلێ تومـــەزە لەوەپێش بەگزادە چەتەوڵەکانـــی بازگەی لـــێ کردبوون، کەدیتیان خۆیەتی، ئەفســـەریان ئاگادارکردەوە، هاکادیتم ئەفســـەر بەسەری کۆت و بەپێی پەتی بۆبەپیر وەهاتن و پێشـــوازی کـــردن لەکونێ دەپەڕی هات، پڕی دایە دەســـتی بەگزادەو داچەماوە لەپێشـــی، بەگزادە، قیتی کردەوە، سەری ماچ کردو دەستی موبارەکی بەپشـــتی داهێنا، گوێم لێبوو لەبن لێوان پستەپستی بوو، گوایە وێردی بەســـەریدا دەخوێنێ، جەنابی ئەفسەر لەبن دەستیدا وەکو ئایشـــە گوێدرێژ گوێی بەردابووەوە، تیچاوم دابووە موسافیرەکان بەهاتنی بەگزادە گەشـــابوونەوە، هەردووکیـــان بەجووتە چوونە ژووری بازگـــە، دوای تـــاوێ هاتنەوە دەرێ، مەعلوم بوو، دەســـتێکی بەقینگی

داهێنابــوو مێی کردبوو، جەنابی ئەفســەر، بەدەنگێکی بڵندو بەگفتاری ئەودیوی جەبەل حەمرین، گوتی:

(لەبەخاتری شــێخمان هەردوولا بەربەستی بازگە وەلانێن، بابڕۆن.) ڕێگای بەخەڵک دا، هرپانکردێ، ئەو داماوانە بەســەر و دەســت و بەزار سوپاسی گوزاریان ئاراستەی بەگزادە دەکرد، لەم ڕەزالەتە ڕزگاریان بوو، خەنی بوون.

دواتر ئێمەش بەڕێکەوتینەوە، کەلەبازگە بەدوور کەوتینەوە، جەنابی بەگزادە لەقاقای پێکەنینی دا، گوتی لەوەپێش پێمگوتن: ژیان لەســەر بنەمای بەرژەوەندی دروست بووە، ئەگەر بەرژەوەندی لەنێواندا نەمێنێ؟! بێشک ئادەمیزاد پەکی دەکەوێ، شیرازەی ژیان لەبن بۆتکەوە هەڵدەتەکێ، بۆیە پێویســتە مرۆ لەزمانی ســەردەم، لەزمانی ئەو (داک خۆ.) یانەی کەلەکەبازگەکان و هەر شوێنەکی دیکەدا، مرە مرو حەپە حەپیانە، دەبێ بزانێ لەتەگۆشــتێک هەڵداتە بەردەمیان، هەنگــێ دەبینی کوو کلکیان دەگەلۆزیان دەنێنەوە و لەپێشــت دەقروســکێنەوە، ئیتر لەوە بەدواوە هەرچەند جاری بەبەردەمیاندا ڕەت بی، جگەلە کلک بادان، خۆیان لەگورە نابەن، بەڵام دەبێ زۆر هەســتیارو وریای خۆت بی، ئەگەر هاتوو جارێک لەجاران گۆشتیان بۆ هەڵنەدەی؟! مسۆگەر بزانە لەپاشڕا بەکەڵپەکانیان خرچە لەبەلەکتەوە دێنن، بێجگە لەگلاوبوون، جەســتەت خەڵتانی خوێن دەکــەن، لەپیاوەتیت دەخەن، ئەو ســپڵەو ناکــەس بەچانە جێی بڕواو متمانە نین، کەبکەونە تەنگانە دایکی خۆیان بەیەک عانە دەدەنە مەزات و هەڕاجی دەکەن، ئەو کورســییەی مەزنەکانیان لەسەری هەڵقونجاون، لەبنیــان دەردێنن، بەچەپڵەڕێزان و تەنەکە لێدان، شــاربەدەرو ترۆیان دەکەن، بەلنگە سۆلی سەروگوێلاکیان دەکوتنەوە، لەوەش سەیرتر، وەکو بارگینی دێوەرە، تورەگەیان بەســەری وەدەکەن، ئەگەر دەپرسن، ئەی ئەم هاتوهاوارە و سەگ وەڕینەیان لەچی؟! بێگومان تەنیا بابژەیە لەزگی خۆیان وەبەر بای دەدەن، هەموو بۆ چاوبەست کردنی جەماوەرە، ئەگینا سەبارەت بەمیللەتی خۆیان سپڵەو بێ خێرن، وەکو ڕێوی وان، نامەردانە

دەســـتدرێژی دەکەنە ســـەر ئابڕووی بەچکەی خۆیان لێی ناپەنگێنەوە، ڤێجـــا زۆربێ شـــەرمانە لەپێـــش مایکرۆفۆنەکانەوە، شـــانازی بەم دوو ڕووەییەی خۆیان دەکەن، منەتیشـــیان بەمێژوو نییە، چی دەنووسێ یان نانووسێ؟!

من، هەتا ئێرە گوێبیســـتی بەگزادە بووم، دیارە بەخەودا کەوتبووم، کاتێ چاوم هەڵێنا، سەلیمەگۆج بوو ڕایدەهەژاندم، دەیگوت (هەستە بابە هەســـتە، ئێرە نەئوتێل بەلاشـــە، نە باوەشـــی گەرم و نەرمی خانمانە والێت خۆش هاتووە، وەکو بەرخی تێر شـــیر پڕخەت دێ.) بەگزادە لێی وەرگرتـــەوە گوتی (پیرەژن، وای مژتووە هێزی لەبەر بڕیوە، چاوی بڵند نابی، ئـــەی قەرزی ئەو دوو دانەی والەماڵـــەوە چاوەڕوانن چۆن؟!) لێم وەرگرتەوە گوتم:

ئەم تیرو توانجانەی ئێوە وەک ئەوە وایە!

دوومنداڵ هەبـــوون لەگوندی، دایکیان بەکیژێنـــی ڕەدووکەوتبوون، ڕۆژێکیان لەکاتی یاری کردنا بەشەڕهاتبوون، یەکێکیان بەئەوەی دیکەی گوتبوو! داک بەدووکەتی،

منداڵەکە بەگریان دەچێتەوە بۆلای دایکی، دایکی لێی دەپرســـی لۆ دەگرێی؟! منداڵەکە دەڵێ: کوڕی فلانە ژن پێم دەڵێ: داک بەدووکەتیدایکی پێـــی کوت مەگری ڕۆڵـــە، بەقوربانی دایکی (ئەو) بـــم، بۆ ئەو ڕۆژەی کەبەســـوار ســـوارانێ و تەقەتەقی تفەنگ و دەهۆڵ و زووڕنا هەڵپەڕکێ و شـــایی ڕەشـــبەڵەک و شـــاباش، چەند جوان بوو ئەوکاتەی بەسواری مایـــن بەبـــووک هێنایان، مەگەر هەرخۆی بزانێ چەنـــد بەگەرم و گوڕی پێشوازییان لێکرد، گوجەگوتی: کەواتە ئەگەر لەکین، هەموومان یەکین، ئیتر بەپێکەنین پەرتەمان لێکرد بۆ ماڵ

شـــەوێکیان شـــەودرەنگ بوو، ســـەری باوڵم هەڵداوە سەفتەی پارە دەتگـــوت: مێگەڵی مەڕە لەنێرینەی وەرزی بەهـــاردا، لەکاتی نیوەڕۆیی لەبێردراون، پاشان شوان لەهەوێزێ مۆڵی داون، کەمێک دەستم بەسەرو ڕوومەتیان داهێنا، لێیان ورد بوومەوە، دواتر سواری ئەسپی خەیاڵ بووم، ئەســـپ باڵی گرت بەرەو ڕابردوو تێی تەقاند!! ئەحەڕووت، کاسەپڕبووە خەریکە لێی دەرژێ، بێگومان جەرەش لەڕێی ســـراوێ دەشـــکێ، وەرە دەستی خۆت لەهاوبەشی گۆجەو بەگزادە بکێشەوە، بەتەمای چی؟! بای حەفت پشـــتت لەســـەر یەکدی داناوە، خۆ بەنیاز نی ئالای دەوڵەمەندی هەڵکەی؟! دەئاوڕێک لەڕابردووی خۆتـــان بدەوە، کەلەگوندبوون باوکت ماکەرێکی پشـــت کولی هەبوو، پتـــر لەنیوەی کلکـــی بەهەتک بڕابوو، خاڵوانت لەجیاتی خوێنی دایکت شـــەو هاتبوون کلکی ئەو بێگوناحەیان بڕی بـــوو، وەبیرتە! هەموو جـــارێ بەهوردە خۆری ژێر دەســـت و پێ وســـمی وڵاخی بن دۆراب، برینی پشتی کەرەکەت پێ تیمار دەکرد، ئەو

ڕۆژە بێنەوە پێش چاوی خۆت لەتەنانێکی مزاشـــی مەزرەقەت دەکردە، ناونانێکی هەورامانی دەتکـــردە بابۆڵەو هەندە بەلەزەت قەپاڵت لێدەدا، پێتوابوو هەرمیشکە دەیخۆی گوایە بەتەمای چی؟! لەجیاتی ژنێک دوانت لەبن چۆکییە، دەبێنەوە پێش چاوی خۆت، کاتێ درەنگانی شەو لەترسی سەگەبۆر بەترس و لەرز، بۆبەدکاری بەپارێزەوە دەچوویە تەوێلەی ماڵی خالۆ ڕەجەبی سەرکاری ئاوایی وگڕ جاشماکەرەبۆزلەم خەیاڵاتەدا بووم، تومەزە نۆبەتە شەوی هەیبەت خان بوو هات، بەڵام چ هات؟! خۆی تیف تیفە وتاس و لووس و ســـازدابوو، هەندێک شــــەوچەرەی دانابووە سەر دەورییەکـــی چکۆڵە، گوتی (دەوەلاینێ پیـــاو، ئەو وەختە کەی وەختی پارەو حیسابە، شەوکاتی دەستگەمەو گەوزگەوزانێ و ڕامووسان و ئاوێزان و ئەسڵەن شەو زەوادی دڵ و دەروونە، پارەچڵکی دەستە، کەلە سنووری پێویست زیادو بەدەربوو، دەستت لێدەستێنێ دەتکاتە دیلی ژێر دەستی خۆی، خواردن و خواردنەوەو خەوت لێ حەرام دەکات، شــــیرازەی ژیانت لەڕەگەوە دەپچڕێنێ، ژیانت لێدەکاتە قوزەلقورت و زەقنەبووت و ژەهری مار، وابێ هەتا لەژیاندا داماوی هەرتاڵاو بنۆشێ.)

: ئەو هەرگیز قســـەی لەقســـەی هەیبەت خان نەدەکرد، زۆر جاری وابـــوو لەپەســـن و پیاهەڵدان بەهەیبەت خان دەیگـــوت: یەزدانی مەزن هەرچـــی جوانی و شـــۆخ و شـــەنگی پێکەنین و گفتارو زمان شـــیرینی هەیە بە هەیبەت خانی بەخشـــیوە، جەستەو لەش ولاری هەیبەت خان، تەنک تەنک چەشـــنی پەڕەی گوڵی پەمەیی و ناسکە، کەسەرم دەخەمە باوەشـــی، هەرچی ئێش و ئازارو ماندووبوون و دەردەسەری و مەینەتی ڕۆژانە بەرەنگارم دەبێتەوە، بەتایبەتی کەگۆی مەمانی دەخاتە ناو زارم، بەشێنەیی دەست بە سەرو قاقۆلم دادێنێ، وەک ئەوەی بڵێی: بەهەتوان چەورم بکات هێورم دەکاتەوە، لەباوەشـــیدا وەکو زارۆی تێر شیر پرخەم دێت، لەگروگاڵ دەکەوم، ئاایکەئافرەتێکی بەبەزەیی و میهرەبانە، مەگەر لەباوەشـــی دایکمدا هۆتۆ هێمن و ئارام بەئاسوودەیی خەوتبم، ئافرەتی میهرەبان و ڕەوشـــت بـــەرز، دیارییەکی هەرەمەزن و جـــوان و پیرۆزی

پەروەردگارە بۆ حەسانەوەی پیاو، کۆڵەگەیەکی بتەو وکۆڵنەدانە لەکاتی تەنگانـــەو لێقەوماندا، پیاوی دووژنان بەدەگمـــەن، ئەگینا جەرگی کون کونـــە، لەبـــەر دووکە دووک و دەمەقاڵی و پرتەو بۆڵەو شـــەڕو ناکۆکی نێوان (هەوێ)یان، قەت ئاســـوودەو کەلەکـــەی ناکەوێتە عەردی، بەڵام هەرچی هەیبەت خان بوو، بەڕەوشـــتی بەرزو هەڵس و کەوتی مرۆڤانەی، بەخوڵقـــی نـــەرم و نیانی، دەنگی لەبەر ڕەحمەخانـــی هەوێی بڕی بوو، ڕەحمـــە، ڕۆحی لەوجێییە بوو هەیبەت خان پێی لەســـەردادەنا، هەرچی جوان و پیرۆزو قەشـــەنگە لەم دونیایەدا، ناگاتە لاســـەنگی تاتەرازووی ئافرەتی ڕەوشت بەرزو میهرەبان و خانەدان.

لەگەڵ هاتنە ژوورەوەی هەیبەت، دەســـتی لەهەژمارکردنی پارەوپول ڕەق بـــوو، لەدڵی خۆیدا گوتی (ســـوبحانەللا، لەم بەژن و باڵایە، یاڕەبی خودایە لەچاوی پیس و ئیرەیی بە دووربێت.) دواتر لەگەڵ هەیبەت خان و لەنـــاو بۆن و بەرامی خەناوگـــەی قەنەفرو گەردانەی مۆری و مەرجان، دەستبازی و بەزم و ڕەزمی ڕامووسان ئاوێزانی یەکدی بوون تادەمەدەمی سەرەتاتکێ و گەزەنگی خۆرەتاو، وەکو لاو لاو تێک ئاڵابوون (هەورەکان مەگرمێنن، بەم نیوەشـــەوە مەشـــریقێنن، خەو لەچاوی خۆشەویســـتان مەزڕێنن.)

-١٧-

گۆجـــەو بەگزادە، بەقســـەی خۆیان لەگـــەڵ ئاخوندێکی ئەودیوی سنوور وارێک کەوتبوون، لەدیوی ئەودیو قەپێلکی حەبی گولاج پڕکەن لەنەشاســـتە و تلیاک، بەبەردێک دووچۆلەکەی ڕاوبکەن، گولاجەشین و ســـپییەکە نیشانەی نەشاســـتەبوو، بەدەرمان فرۆشانی سەرشۆستە و بازاڕی شێخەڵڵای بفرۆشـــنەوە، هەرچی گولاجی قەپێلک زەردو سەوز بوو، نیشانەی تلیاک بوو، بۆ ئەمەش کڕیاری تایبەتی خۆی هەیە، دێن دەیبەن لەشارەکانی دیکەدا ساخی دەکەنەوەگۆجە و بەگزادە، لەهەوڵی ئەوەدابوون! ئەم تێکەولێکەیـــە لەدووکانی من تاتۆێ بکەن، بەڵام من پێشـــتر بڕیاری ئـــەوەم دابوو کەخۆم لەکارکردن و هاوبەشـــی ئەواندا بکێشـــمەوە، لەکنە خـــۆم هەریەکە و پوولێکی قەڵپـــم لەنیوچەوانیان دابوو، سەرفم کردبوون،دواتر ئەوان لەقونجە دوکانەکی لاپەڕگەی بازاڕ، خاوەنی دوکانەکەیان دەستخەڕۆدابوو، بەبیانووی بازرگانی داودەرمانی نەخۆشـــی تیادا دەســـتبەکاربوون، بازاڕیان گـــەرم و بەهەرمێن بوو،

بەگوتەی خۆیان پارە بەسەریاندا دەباری، بەڵام پاش قەدەرعەیامێک ڕۆژێکیان لەناکاو پۆلیس لەناو دوکان بەسەریان دادەدەن کابرای خاوەن دوکان و گۆجەیان قیرەبرکردبوو، لەکونە ڕەشەیان پەستابوون، کابرای خاوەن دوکان ئەو قوڕبەسەرە، لەهۆڵی دادگابەردی هەڵدەدا بۆ ئاسمان سەری خۆی دادەبەری، بەهەزار پێغەمبەر و قورئان، بەسەد شێخ و مشایەخ، بگرە سوێندی بەشەرەف وناموس و تەڵاق دەخوارد دەیگوت: (بێ بەریم، ئاگام لەم تێکەو لێکەیە نییە و هەستم پێ نەکردووە، نەمزانیوە ئەم قەپێلکە گولاجانە تژی نیشاستە و ساختەن.) کەچی بێ سوودبوو دواجار بۆ ماوەی ساڵێک زیندانییان بەسەردا سەپاند، ئەگەرچی سەلیمەگۆج هەمووجارێ لەبەردەم دادوەر، داکۆکی لێدەکرد دەیگوت: (جەنابی حاکم، من و بەگزادە هاوبەشین، دەستمان لەم کارەدا هەیە، ئێمە ئەو بەلەنگازەمان دەستخەڕۆداوە، ئاگای لەم سەین و بەین و سەودایە نییە.) هەرچەند جاری گۆجە ئەم گفتاردانەی دووبارە دەکردەوە، جەنابی دادوەر، پتر لێی لەڕق ڕادەچوو، بەڕوویدا دەتەقیەوە دەیگوت: (ڕاست ناکەی ئەمە بوختانە، تۆ، دەتەوێ ئەم زاتە (بەگزادە) تێوەگلێنی، گەرەکتە لەپایەندازی ئەم مرۆڤە ڕەوشت بەرزو ئایین پەروەرو خواناسە کەم بکەیتەوە، بەڵام ئەوەش بزانەکە! (دەریا بەدەمی سەگ پیس نابێ).

گۆجە لەقاران شێت و هاردەبوو، وەکو جوانەگا دەیبۆڕاند، بەچەپەڵۆک وەردەگەڕا سەرو پۆتەلاکی خۆی، هەندێجار لەبێ دەسەڵاتی لەسەلای گریانی دەدا، وەکو منداڵی ساوا دەنوزاوەلەلایەکی دیکەوە، خزمی نزیک و خزمانی خەزوورانی سەپانی شێخی، لەدەرەوە هەروگیف و هەڕەشە و گوڕەشەیان لێدەکرد (چۆن؟! دەم ڕووتێکی بەرەڵلا سووکایەتی بەجەنابی بەگزادە دەکات، ناماقوڵی کردووە لەگەڵ باوکی، خوای دەکرد بەس بکەوێتە چنگمان، دەبێ وەکو (کار) سەری لەلاشەی جیابکەینەوە، بەگونی باوکیدا دەڕێنین، سەگ تۆپی دەکەین.)

گۆجه لەزاری پۆلیسەکانی بەندیخانەوە، گوێ بیستی ئەم هەموو هەڕەشەو گەف کردنەی شۆڕباخۆران دەبوو، لەقاقای پێکەنینی دەداو دەیگوت: (بەگزادە بەو لەسەربەرد بە، لەساماری لۆت دەباری)دواجار بەبڕیاری دادگا دووساڵ بەندکردنیان بەسەریدا سەپاند، باش کاتبی دادگا پێی گوتبوو(هەروەک لە پەروەندەکەتدا هاتووە، خێزانداری و منداڵت هوردن، بۆیە جەنابی دادوەر، بەزەیی بەخێزان و منداڵەکانتدا هاتۆتەوە، ئەگەر نادەبووایە لەبڕی ئەوەی بووختانت بۆ جەنابی بەگزادە، ئەو زاتە پیرۆز و خواناسە هەڵبەستابوو، بەپێی یاسای مافی مرۆڤ، هەق وابوو لەبڕی ئەم ناماقوڵییەتەوە، لانی کەم بەساڵێک زیندانی سزابدرێی، ئیستاش واچاکە تائەو ڕۆژەی لەژیاندا ماوی، مەمنوونی جەنابی بەگزادەبی، چونکە سکاڵای لەسەرت تۆمار نەکرد.)

لەلایەکی دیکەوە بەگزادە دەیگوت: (هەرکەسێک فرت و فێڵ لەخانەوادەی ئێمەی نەجیبزادە و ئایین پەروەرو خودان تەریقەت بکات، ئەگەر ئێمەش نەوەی نەجیبزادان پێ نەحەسێن، بێگومان جددی باب و باپیران پێ دەحەسێن، وەکو(لەمەچێتر) لەغەیبەوە دەستیان لێدەوەشێنن، گێڕو وێردو دەم و لەوسیان خوار دەکەن، بگرە لەپیاوەتیان دەخەن، وابێ ببێتە پەندو عیبرەت بۆ هەموو ئەو ڕافزیانەی کەبەگومانەوە، یان بڕوایان بەپلەو پایەو غەیبزانی بەگزادان نییە، من دڵنیام کە سەلیمەگۆج لەپاشەملە وەکو پشیلە ڕشاوەتەوە، یان لەو پارەو پوولی کەبە شەونخوونی پەیدام کردبوو، خستبوومە بەردەستی، دیارە خیانەتی لێم کردووە، لەگەڵ ئەوەشدا حەزم دەکرد یارمەتی بدەم لەم تەنگ و چەڵەمەیە ڕزگاری بکەم، بەڵام لەتوانای مندا نییە، ناوێرم دەست لەئیش و کاری باب و باپیران وەربدەم، نەبادا وەکو(کۆرە وەیباب) پێموەبدەن، ژەهری توڕەیی خۆیان بەمندا برێژن).

: کەچی بەخۆی لەدڵی خۆیدا دەیگوت: درۆزن ڕووی ڕەش بێت ئەگەر وایە؟!

بەگوتەی ئەو پۆلیسەی کەلەبنکەی پۆلیسی درزاوە، کەئاگای لەبنج و بنـــەوان و تێکەو لێکەو کاکـــەو برالەی نێوان پلەدارو بەگزادە بووە، کەجەنابی بەگزادە لەبنەوە ژێراو ژێر دەستکێش ئاسای پۆلیسی لێیان ئاگادارکردووەتەوە، هەردووکیانی بەگرتن دابوو، دەســـتیان بەســـەر حەبی قەڵپ و چەندان کێڵۆ تلیاکدا گرتبوو، تلیاکەکەیان وەکو ئاردی نـــاودرکان بن گۆم کردبوو، چونکـــە لەکاتی دادگایی کردن دا، دادوەر فرێ بەسەر تلیاکەوە نەبوو، تەنها لەسەر حەبی ساختە دادگایی کابراو گۆجەی کرد، سزای بەسەریاندا سەپاندبوو، لەکونە ڕەشەی پەستابوو، تەنیا جارێک بانگهێشـــتی بەگزادەی نەکردبـــوو، تاکو لەدادگا لەگەڵ گۆجە ڕووبەڕووی یەکدیان بکات،

ـ باشە یارۆ، لەتۆ دەپرسم، ئەی وێنەی ئەم (تەرازوو)ەی لەهۆڵی دادگا لەبان سەری دادوەر هەڵواسراوە مانای چییە؟!

ـ یاســـا لەسەر کەژییەکی لاستیق تۆمارکراوە، بەپێی بەرژەوەندی دەســـترۆ، دوو فاقیانە بەکاری دێنن، وەکو ئۆ ڕێزکانێی ئۆمەرەخێڵ و ژنەکەی، لەدوولاوە بەردی سواربوو، دەیگۆتە ژنەکەی! حورمێ خەیاڵ نەکەی لەدوولاوە داشم سوارە، جابەوەی (.) ێم، بەوەی دەت ()ێم.

لەوەپێش خەڵکی سـادەو سـاکار، کەلە دەروونەوە بەزەییم پێیاندا دێتەوە، کەچی ئەوان بەمنیانەوە گرتبوو، هەرچی باوبڕی لەدڵ و دەروون و هورگیاندا پەنگاوەی دابۆوە، لەقوونە چایەخانەو بن دیواری مزگەوتان، بەهەڵبەسـتنی بوختانی ناڕەوا دەرحەق بەجەنابم، بەقسەوقسەڵۆک ئەم باوبڕەیان وەبەر بادەداسـڵاو لەئەقڵتـان، ( بەکەرێ ناوێرن، غاردەدەنە کورتانی) ئەگینا من لەچاو بەرپرسێکی حکومی، پلەدارێکی فەرمانڕەوا، یان لەچاو کوڕە مەسئولەکی چکۆلەی حیزبی، چیم هەیە؟! تاکو بکەومە سەرزمان و زاران، سـوێند دەخۆم بەوەی کەسەری حازر خۆرانم نابێتە ژێـرگڵ، هیچی وام نییە شـایانی حیسـاب و کتاب بـێ، هەیتم ونیتم! ئوتێلۆکەکی گەشـتیاری پێنج ئەسـتێرەیی مۆدێرن، لەسـەر ئەندازەو شێوازی غەربی بنیات نراوە، چێشت لێنەرو کارمەندو کارگوزارو بەردەست و پێشـوازی کاران بەگشتی، هەرهەموویان کیژۆڵەی خڕو پڕو شۆخەژنی چاو باشقاڵن، بەجلوبەرگی مۆدێرن و سەردەمیانە، لەهونەری (مەساژ)دا

دەســـتێکی پیرۆزیان هەیە، بەتایبەتی کاتێ گەنج و لاوانی شار، کەلەبەر خەوتن و بێ ئیشـــوکاریاندا سەرتاپای جەستەیان ڕەق دەبێت، ڕوو لەم هوتێلە دەکەن، ئەو کچۆڵە ناســـک بەدەن و ئەوخانمە شۆخ و شەنگانە بەزەردە خەن و نەرمە پێکەنینی مەرکربازانە و ئەفسووناوی بەلەنجەو لاری هەوەس بزوێن پێشوازییان لێدەکەن، دوای ڕووت کردنەوەیان لەسەرچاو درێژیان دەکەن، زۆر بەزانایی و لێهاتوویی هێواش هێواش دەیانشـــێلن، دوای شێلان یاری مژمژانێیان لەگەڵدا دەکەن، بەهۆی ئەم شێلانکارییەوە ئوتێلەکەمان شوهرەتی دەرکردووە زۆر بەهەڕمێنەلەناوجەرگەی بازاڕ دوو باڵەخانۆکـــەو ڕێزە دووکانۆکەکم هەیە، بڕواتـــان بێ هیچی ئەوتۆم نییە پێـــوەی بنازم، یان جێ چـــاوی خەڵک بێ، هەییتم نیتم! دوو ســـوکنە لەگەڕەکی دۆلاراوە، بەهەردووکیان لەســـەر ڕووبـــەری هەزار مەتردووجا دروســـت کراون، یەکیان بەناوی ڕەحمەخانە، ئەوەکەی دیکەیان تاپۆی بەنـــاوی هەیبەت خانە، تێدا ســـتر بوونە، ئاا! چاک بوو وەبیرم هاتەوە، لەدەروازەی شار بازاڕۆکەکی هاوچەرخم پێک هێناوە، جلوبەرگی مۆدێرن و پۆشاکی محەجەبەو دەستووری ئیرانی و ئیماراتی و هەندێ هوردەواڵەی جوانـــکاری ژنانـــەو، کارگێـــڕو کارمەندەکان بـــەزۆری لەتوخمی نەرم و نیاننلێتان ناشـــارمەوە، کاکە درۆتان لەگەڵ ناکەم، بۆ بەسەربردنی کات و ڕۆژانی بێ تاقەتی و بەدوور کەوتنەوە لەژاوەژاوی حەشیمەتی ئاپۆرای خەڵکی شـــار، هەندێک دارو درەختم لەسەر ڕووبەری پێنج دۆنم زەوی، لەدەرەوەی سنووری شارەوانیدا ڕواندوومانە، هەرکاتێ هەست بەبێزاری و دڵتەنگی بکەم، یان بۆ هەواو ژینکە گۆڕین، ناوە ناوە بەئیمێل داوەتنامە بۆ هونەرمەندانی ناســـک و جوان و شـــۆخ و شـــەنگ و دەنگ خۆشانی دوورە وڵات دەنێرم، ئیتر شـــەوان بەبەشداری دۆست و بەرپرسانی پلەو پایە بەرزو پسپۆڕ لەبواری پیشەسازی چەرم و ڕەزگەری و تەکنەلۆجیای سەردەم و دیبلۆماســـیەتی بازرگانی هاوردەکاری خزمەتگوزاری لەبواری گوتاربێژی و ڕیکلام، بۆ گەشەپێدانی عیلمی کارەباو زانستی تەڕاتێنگە، ئیدی بەئاهەنگ وسەما گۆرانی شەوگار بەڕێ دەکەین.

بۆ مەسەلەی پارەی هیشکە نازانم چەندم پارەو پووڵ لەمامەلەو سەودا دایە، چەندم لەبانقە، سەرم تێچۆلاوە، ئەوە پەیوەندی بە (سکرتێرەخان) ەوەیە، مـــن هیچی لێ نازانم، جانەوەی بەلامەوە مایەی پێکەنین وگاڵتە جارییە! من، بەم دوو قرێژەوە ســـەرم لێ شــێواوە، هەش وەســـەر ئەو ساماندارو مەســئولانەی کەچەندیان لێرە داکردووەو مەگەر خۆیان بزانن چەندیان حەواڵەی هەندەران کردووە، مەگەر هەرخودا بزانی کوو؟! سەریان لێ شێواوە و ئەقلیان لەکارکەوتووە، لەخودی خۆیان بەگومان کەوتوون، بگرە هێندە دڵتەنگن بەقەدەر کونی نووکی دەرزی ڕۆشـــنایی تیادا بەدی ناکەن، چونکە لەناخەوە ترسێک گەماڕۆی داوون، لێی کردوونەتە باریکە ژان، سەردڵی گرتوون، لەحەژمەتان فرچاویان نابینێ.

لەوەپێش پێم گوتن: ئەو خەڵکەی کەبوختانیان بۆم هەڵدەبەســـتا، ئەوانەی ناوو ناتۆرەیان دەدایـــە پاڵم، ئەو ژنانەی کەبە ئەحەقوونخوارو ئەحەڕووت ناوزەدیان کردبووم، لەپشتەوە گەشکەیان پێم دەگرت، زمانیان لێم دەردێنا، سەریان خستبووبن سەری ڕەحمەخانی هاوسەرم!

(کچـــێ بابان کۆر، کوو مێـــردت بەم پیـــس و چەپەڵەکرد؟! چۆن لەئامێزی ئەم پیاوەدا ڕۆژت لێ دەبێتەوە؟!)

ئەگەر کارئەوها بەڕێوە چووبایە؟!بێگومان ڕەحمەخانیشـــم لەدەست دەدا، بـــەڵام هەروەکـــو دەڵێـــن: (ئەوکـــەس مەردە، کەبـــەڕی خۆی لەئاودەربێنێت) هەنووکە هەر ئەو خەڵکەی گۆرین، کلکە سۆتەییم لەپێش دەکەن، بەهەرکوچەو کۆڵانێکی شـــاردا ڕادەبـــوورم، دوکاندارو چەقاڵ و بەقاڵ دەستە دەستە بەرزەپێ لەحزورمدا هەڵدەستنەوە سەرپێ، دەست لەسەرسینگ ڕادەوەســـتن، لەبەر مامەحەمەیی وام لێهاتووە، بەپیادەڕۆ ناوێـــرم بەناو بازاڕدا بای پێی خۆم بدەم، بگرە ئاســـنگەرخم چیکورتان دوورنورەفرۆش و سەوزەچی بەفەرموو، فەرموو کەرەمکە یاشێخفەرمووم لێدەکەن، منیش خۆم شـــێلوناکەم، بەئاستەم بۆیان دەخەنمەوە، بەسەر سوپاسیان دەکەم.

مرۆگەلی ئەم ئاقارە ڕەزیل و سەفیل و دیلی بن دەستی پیاوی پارەدارو

پوولەکین، هەر ئەو مرۆگەلەبوون لەڕۆژگاری ڕابردوودا بەئەحەشەل و دزی کوڕی دزو نازانــم چی و چی بانگیان دەکردم، کەچی هەرئەوانن بەهۆی ئەم دوو قرۆشـــەی کەبەشێوەیەکی ناشەرعی و ناياسايی پەیدام کردووە، ئیستاش جگە لەوەی تەمەننام بۆدەکەن، دوعای خێرم بۆ دەکەن، بەزم لێرەدایـــە! ئەو ئافرەتە لووت بەرزانـــەی گەڕەکی دزاوە، کەلەکاتی خۆی لچیـــان لێم هەڵدێنا، ئەمڕۆ بەئاواتن لەگەڵیان ڕابوەســـتم چاکو چۆنیان لەگەڵدا بکەم، بەیاشێخ، یاشێخ دەمدوێنن.

ئەوێ ڕۆژێ لەخۆم تەریقبوومەوە، ئافرەتێکی بەســاڵاچوو دەســـتی کوڕێژکەیەکی پێ پەتی گرتبوو، پێشی لێم گرتەوە گوتی (بەقوربانت بم یاشێخ ئەم هەتیوە زێدە جەرگمە، زۆر بێعار و لاسارو دەوپیسە جوونان دەدا، چونکی دەزانی دەســـتم ناچێ ئازاری بدەم، هەراسانی کردووین، خێرتەگاتێ قوربان، بەتفەڕک (تف)ێک بکەزاری و بەدەستی موبارەکتان دەستێک بەسەریدابێنە، بەڵکو لۆمان ئاقری دەکەی.!

لەبەر دڵی پیرەژن، دەستێکم بەسەرو قژی داهێنا، پاشان دوو (دەبایی) م لەمستی پیرەژن نا، پێم گوت:

داپیـــرە، بەم پارەیـــە جووتێک پێڵاوی بۆ بکڕە، کێلۆیەک گۆشـــتی نەرمەش بکڕە، جوان لەڕۆن و پیازیدا ســـووری بکەوە دەرخواردی بدە، بەئومێدی خودا، دڵنیابە بۆی دەبێتە شیفا، چیتر بێعاری ناکات و جونان نادات

ئـــاخ خپارە، کوو بوویتـــە هەتوانی زام و برینـــان، کلیلە، کلیلێکی ئەفسووناوییە، قوفلی گشت دەرگا داخراوەکان دەکاتەوە، هەرچی جادوو و تەلەســـم و نووشـــتەی ئەبو دووجانەیە، هەرهەمووی بەتاڵ دەکاتەوە، ئەگـــەر گیرفانت گەرم بوو؟! بچێتـــە دیوەخانی پیاو ماقوڵان و کۆچکی ســـەرداری عەشیرەتان، بۆ هەوراز پەلکێشـــت دەکات، بەگاڵتەوە ناڵێم! هەرچـــی کاربەدەســـتی پایەدارو پلەبەرزە وەکو بەرخـــە مێژکە، مێچکە مێچکەم لەبەر دەکەن، لەســـەر ناحەق پشـــگیریم لێدەکەن نەئاگام لێیە نەچوومەتە مزایەدە، بەتەلەفۆن ئاگادارم دەکەنەوە!

(یاشێخ، تەندەری فلانە پرۆژە بووە قسمەتی بەرێزیان، بەڵکو پارەی تەندەرو تەئمیناتەکە بنێری.)

بەشەرت و پەیمان هەرکەسێک لەخۆی ڕادەبینێ، بابێ گرەوی لەگەڵ دەکەم، ئەگەر لەهەڵبژاردنی ئایندەدا بۆ ئەنجوومەنی شارەوانی پایتەخت، خۆم کاندید بکەم، ئەگەر زۆرینەی هەرە زۆری دەنگەکانم بەدەســت نە هێنا؟! بەهەر دەپەنچە بۆی مۆر دەکەم، بەشەش بەرد سوێند دەخۆم، ئەم سمێڵەش پاک دەتراشم، ڕازیم بەوەی تەنەکە بەکلکمەوە بکەن، بەتەنەکە لێدان و چەپڵەڕێزان، منداڵە هورتکەی دزاوە بەتیلکە مەسوســانێ شار بەدەرم کەن، هەرگیز لەم گرەوە پاشگەز نابمەوە، چونکە زۆرچاک دەزانم کەحایوحوی دەروێش بۆ شــۆربایە کەس پشتی بۆ مامە شێخ نەشکاوە ئەم هەموو دادو.فیغان و فرمێسک هەڵڕشتنە و زنجیرلێدانە کەس گوونی بۆ (حەن و حوێن) لەخم نانێت.

ئێستا حاڵی بوون، دڵتان داکەوت، زانیتان بەچ ڕێگایەک؟! ئەم هەموو سەروەت و ســامانەم کۆکردووەتەوەو لەســەریەکم داناوە، بەناوودەنگ و شــوهرەتی خۆم کەوتووم، ئێستا هەســت بەخۆم دەکەم کەمن هەم، واتــا کاری بەرخودانیخۆبەختکردنشۆڕشــگێڕیقوربانی دانپیاهەڵدانپــف دانی لاوانســەردوولکەو نەزیرۆکە بۆ شــەهیدانی ماندوو نەناســعەیبە و شــەرمەبەرژەوەندی گەل و نیشتیمان، هەرهەمووی کۆبکەیتەوە بیخەیتە تای تەرازوو! خرپووکە، بەهەر هەموویان سەنگایی تاکەیەک دۆلاریان نییە لای من، کرپارنیم، ماندووکردی، ســایەوەی حازرخۆر چینەی لێدەکات و نکۆڵی لەماندوو نەناس دەکات.

گەلۆ تائێرە، ئەگەرچی هێشتا زۆرم لەهەگبەدا ماوە بۆتان هەڵیبرژێرم، بەڵام شــەو درەنگەو دەبینم وەنەوز چاوی گرتوون، بەم پرسیارە و پاش کەمێکی تر پەرتەی لێدەکەین.

ـ کێ هەیە لەدانیشــتووانی دزاوە بڵێ: من دزنیم؟! بابێ بەسێ بەرد ئیســپاتی بکات کەدزنییە، بێگومان کەس جەسارەت ناکات ئەم سوێندە بخوات، چونکی ئێمەی خەڵکی دزاوە، چاو لە گەورەکان دەکەین، ئەوان

دەیرژێنن، ئێمەش پێ لێدەخشـێنین، واتا ئەمن دزو ئەتۆ دز، پاشادزو گەدادز، هەموومان هەر دزین و دزپەرستین.

من، وەکو سەردەستەی دزانی دزاوە ئامۆژگاریتان دەکەم، ئەگەر هاتو ڕۆژێ لەڕۆژان بیرۆکـەی دزی کەوتە کەللەتان، قەت نەکەن بچن خۆتان لەقەرەی دزینی شـتی هیچ و پـووچ و چکۆلەو بێ بایەخ بدەن، چونکە بەپێی یاسـاو ڕێسـای مەملەکەتی دزاوە کەوڵتان دەکەن، پێسـتەتان حەواڵەی دەباغ خانە دەکەن، ڕەزیل وسەفیل و ڕیسواتان دەکەن، لەکونە ڕەشـەتان دەپەستن جەسـتەتان کرم هەڵدێنێ، بڕۆن شێلگێڕانە وەکو دزێکـی کارامە وجەربەزەو نەقۆڵا دەسـت لەکونێکی چەور ڕابکەن ئاوی تێوەربکەن، وابێ خۆتان وماڵ و منداڵ و بگرە حەوت پشـتتان لەبەری بسێنەوە هەرگیز نانی کەم نەخۆن، مەترسێن! بەم کارەتان پلەو پایەتان لەنێو ئاپۆڕای جەماوەردا بەرزدەبێتەوە، ڕێزتان لێدەگرن، دڵنیابن، هێندە دوعاو نزاتان بۆ دەکەن، دەسـتە وەسـتان لەیەزدان بۆتان دەپاڕێنەوە، مەپرسـن؟! غەریقی بەزەیـی و ڕەحمەتی پـەروەردگار دەبن، خودای بەخشندەو میهرەبان بەبەهەشتی بەرینی خۆی شادتان دەکات، قەسرێک و حەفتاو دوو حۆری مسۆگەر دەکەن، چونکی نانی کلکەسۆتەیی و چەلاوی مامەحەمەیی و شـۆربای دوو ڕوویتـان فڕنەکردووە، نانی دەرگەوانی و لەچەریی و چاوشـۆڕی و مێچکە مێچکەییتان تام نەکردووە، لەژیانتاندا نانی چاوبەرو ژێریی و نانی حیزیی و سـەلامەتیان نەخواردووە، ژیان و ڕەوشتی گورگانەتان هەڵبژاردووە، گورگێش قەت چاو لەبەرنانێ.

کەچی پاشان لەناخەوە هەناسەیەکی ساردی هەڵکێشاوە، گوتی:

من، لەکردەوەکانمدا هەرگیز پەشـیمان نیم، بـەڵام کەس بەدەردی کەس نازانێ، من نەخۆشم، دووچاری نەخۆشی پڕۆستات و قەبزی بوومە، ئەگەر فتیل و هۆقنە نەبێ؟! شـەق دەبەم، دەتەقم ئەم ناوە ڕادەگێڕم، شـەوان خەوم نییە، کەچاوم داوێمە سەریەکدی بەڵکو چاوم گەرم کەم، دەبۆرژێم و نابۆرژێم، دێنەوە گژم پەنجە لەچاوم ڕادەکەن، سـواری ملم دەبن، بەپێلەقە دەکەونە سـەر هورگم، قرتقرتۆکم دەگرن، هەناسە برم

دەکەن، پێم دەڵێن: (شیلە مژی حازر خۆر، پیاوی بن دیوارو ناو ژنان، چمـــە تۆ گەنەی؟! تێر خوێن نابی، یان تێـــر نەخۆرە بانگی کردووی؟! چاوچنۆک، چاوبەیەک پتە خۆڵ لەهەڵپە دەکەوێ، بەڵام نەخۆشی شیلە مـــژ مەگیرانی بەخوێن دەکات، دەبێ خوێنی خۆی بخواتەوە، هەتا خوێن نەخواتەوە، هەرگیز جەزی مەگیرانی دانامرکێتەوە،)

لەترسان لێوە لەرزەی گرتبوو، بەم چلەی هاوینە لەرزی هاتبوو، وەک هێنی مەیموون دەلەرزی، هەربەم ترسەوە لەجێوە ڕاکشاوە، لێفەکەی لە خۆی لوول دا، چۆکی بەسیینگەوە نووساند، خۆی گرمۆڵە کرد، نەخێر، لەترســـی ســـبەینەی ئایندەدا نەدەکەوتە ناوجـــێ، لەبەرەخۆی ورێنەی دەکرد! مسۆگەر دەزانم، هەرهەندەم خۆشییە هەتا ئەو ڕۆژەی کە جارچی جاڕدەدا! یاللا کوڕگەل خەجەڕۆیە.

بێگومان بەلینگە ســـۆلی خۆم ڕاناگەم، وەکو داڵاش دەنیشنە سەرم لەخرتۆرێم وەردەدەن، بەزیندوویەتی چاوان بە دندووک چاوم هەڵدەکۆڵن، ڕەزیل و سەفیل و زەلیل و مجرۆم دەکەن، چونکە سوننەتی ژیانە!

دایکی دزان ڕۆژێک سینگ دەخۆن، ڕۆژێکیش سینگ دەکوتن.

## بەرهەمەکانی نووسەر

| | | |
|---|---|---|
| ١- قالـــه | جنـــاوی | نۆڤلێـــت |
| ٢- برووســـکەی | شـــووم | .نۆڤلێـــت |
| ٣- کیژگەلـــی ئەشـــکەوتی | دێـــوان | رۆمـــان |
| ٤- شـــەوگاری | گـــورگان | نۆڤلێـــت |

## ئەو بەرهەمانەی ئامادەن بۆ چاپ

١- بەرئاگردانی کوردەواری

٢- واریقاتی کوردەواری

٣- سەمای چۆلەکان ـ چیرۆک بۆ مندالآن

باوە گەورەی شەیتانەکان سێ
پێـیـی لە خـۆی هـەڵـدەدا
هـەڵدەپـەری سـەمـای دەکـرد،
شەیتانە بچوکەکان لێیان پرسی:
- باوە گەورە، پێمان بڵێ بزانـین
ئـەم شـایـی و هـەڵپـەرکێ و
خۆشییەت لە پای چییە ؟!
- گوتی: رۆڵـەکـانم، ئادەمزاد
(سکـە)ی پارەی دامـەزرانـدووە،
پارەوپووڵ دروست دەکەن.
لێرەدا ئێمە ئیسراحەت دەکەین،
چونکە هەرچی رەوشتی بەرزی
مرۆڤایەتییە، بەهۆی پارەوە
لـە دەستـی دەدەن، باب و کور
دەست دەنێنە خنخنۆکەی یەکدی.




چاپخانەی رۆشنبیری

٢٠٠٠ دینار